ڕۆڤار
ژمارە ٨٣
تشرینی دووەم - كانونی یەكەم
ڕۆڤار، بڵاوكراوەیەكی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێكی كورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەكات

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
ئیدریس عەلی

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ١٢٥٠

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێڵی
edrisali16@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەممەد مەولود (مـەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هـەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەممەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالّح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەممەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەممەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدولا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەممەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قـەرەداخـی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەممەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی،قانیع.

سەرۆکی فەخری
شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا
ئازاد بەرزنجی

| ناونیشان | نووسەر | لاپەڕە |
|---|---|---|
| چێوار باخێك لە گێلاس | سەرنووسەر | ٤ |
| ژیاننامەی عوسمان چێوار | ڕۆڤار | ٦ |
| شیعرێك بۆ چێوار | شێرکۆ بێکەس | ٨ |
| چێوار تاڤگەی بەرزهەڵچووی هەست و هونەر | ئەحمەد سالار | ١٤ |
| چێوار و ئەزموون | دڵشاد مستەفا | ١٧ |
| هونەرمەندی گەورەی خێرنەدیو | ئەنوەر قادر ڕەشید | ٢٥ |
| پیاوێك لێوانلێو لە خەون | ئازاد بەرزنجی | ٣٠ |
| ماڵی هونەرەکەی هەمیشە ئاوەدان بوو | سیروان جەمال | ٣٥ |
| چێوار لە نەخشی بیرەوەرییەکانمدا | یاسین قادر بەرزنجی | ٣٨ |
| چێوار و شەقامی دیالۆگ | ئومێد شێخ حسێن | ٤٦ |
| عوسمان چێوار لە یادەوەرییەکانمدا | دانا ڕەئووف | ٥٤ |
| چاوپێکەوتن لەگەڵ عەبدوڵی حەمە جوان | ڕۆڤار | ٥٨ |
| چاوپێکەوتنێکی کۆن لە گەڵ عوسمان چێوار | داڕشتنەوەی ڕۆڤار | ٦٣ |
| ساڵە بەپیتەکان | سمکۆ ناکام | ٦٨ |
| مەرحەباتان لێ بێ گوڵەکان | دلاوەر قەرەداغی | ٧٢ |
| بەردەوان | جەمال غەمبار | ٧٨ |
| چێوار بۆ شابۆی منداڵ سەرەتا و قۆناغە | فازیل جاف | ٨٢ |
| لە زاری هاوسەرەکەی چێوارەوە | ئەختەر محەمەد | ٨٥ |

# چێوار..باخێک لە گێلاس.

چێوار بە هرەمەندێکی دنیای شانۆی کوردیە، بەڕۆحێکی بێ گەردو عەشقێکی گەورەوە کاری لە شانۆدا دەکرد،چ وەک ئەکتەرو چ وەک دەرهێنەرو وەرگێڕیش. لە دوای دامەزراندنی تیپی پێشرەوی شانۆی کوردی ساڵی 1973 هێزی هونەرمەندانەو عەشقەکەی چێوار گەیشتە لووتکەی داهێنان. لە بواری نواندندا وەک کاراکتەرێکی لێهاتوو لە کارە هەرەدیارەکانی وەک پاڵتۆی گوگۆل و مۆلەتی محیدین زەنگەنەو دکتۆر پاڵمی نووسەری ئیسپانی ئەنتۆنیۆ باییخۆ کە خۆی ڕۆڵی دکتۆرەکەی دەبینی بەشداریەکی چالاکانەی هەبوو. لە بواری دەرهێنانیشدا کارەکانی گوڵە مێخەک و باخی گێلاس و گوڵعومەرو مرۆڤ و شارەکەی و ئەحەی کوڕنوو مەلی دەریاو لالو ڤانیادا داهێنەربوو. چێوار لە نووسەرە گەورەکانی بواری شانۆدا زۆر عاشقی چیخۆفی نووسەری بەناوبانگی ڕووس بوو، بۆیە زۆربەی کارە دیارەکانی ئەم نووسەرەی وەک باخی گێلاس و لالوڤانیاو مەلی دەریای کرد بە کوردی و لەسەر شانۆ نمایش کران و پاشان وەک کتێب بڵاوکرانەوە.
چێوار لەو هونەرمەندە بە هەڵوێستانەبوو کە وەک کوردێکی تێکۆشەرو چاونەترس بەرانبەر بە ڕژێمی بەعس دەوەستا، چ وەک هەڵوێستی ڕۆژانەی خۆی و چ لە ڕێی کارە شانۆییەکانییەوە دەستی بەرگری کردنی لە گەلەکەی و مافی ڕەوای هەموو خەڵکیی عێراق هەمیشە لە بەرزیدابوو. ڕاشکاوانە بەرانبەر کارە دزێوەکانی ئەو ڕژێمە ستەمکارە دەوەستا. پێشوازیی لە هەر کارێکی هونەری دەکرد، بەتایبەتی لە شانۆدا، کە بۆنی بەرەنگاری لێبهاتایەو بەردێکی بخستایەتە سەر ئەو تەلارەی کە هونەرمەندو نووسەرە بەهەڵوێستەکانی کورد بۆ سەر خستنی پرۆژەی بەرەنگاری کردن دایان نابوو. چێوار وەک مرۆڤ کەسێکی هێمن و دەست و دڵ پاک و هاوڕێ خۆشەویست و لە پیاوە جوامێرو ناوازەکان بوو.
بۆیە بە شانازییەوە ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار)مان بۆ یادی ئەو تەرخان کرد.

**سەرنووسەری ڕۆڤار**

**ڕەووف بێگەرد**

10 / 12/2014

# ژیاننامەی مامۆستا عوسمان چێوار

**ڕۆڤار**

عوسمان محەمەد ئەحمەد ناسراو بە مامۆستا عوسمان چێوار ساڵی ١٩٤٥ لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی هاتووەتە دنیاوە.

ساڵی ١٩٦٦ خوێندنی ئامادەیی تەواو کردووە. ساڵی ١٩٦٨ پەیمانگەی مامۆستایانی لە سلێمانی تەواو کردووە و ساڵی ١٩٧٠ بووە بە مامۆستای سەرەتایی.

هەر لە شەستەکاندا تێکەڵاوی چالاکیی کوردایەتی بووە و بۆ ماوەیەکیش چەکی پێشمەرگایەتیی لە

شان کردووە. هەر لە سەرەتای تەمەنی لاوێتییەوە ئاشنایەتیی لەگەڵ هونەری شانۆدا پەیدا کردووە. لە کۆتایی شەستەکانەوە گەلێ چالاکیی هونەریی شانۆیی نواندووە؛ پاشان وەک دەرهێنەرێکی بەتوانا چەندین شانۆیی ئامادە کردووە و دەرهێناوە. چەندین خەڵاتی لەسەر ئاستی عێراق لە چالاکیی قوتابخانەکاندا وەرگرتووە. لە بواری شانۆی منداڵاندا دەستێکی باڵای هەبووە و لە بەڕیوەبەرێتیی چالاکیی قوتابخانەکاندا جێدەستی ڕەنگینی بە تەواوەتی دیار بووە. لە سەرەتای شەستەکاندا لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی تردا تیپی شانۆی "خەبات"یان دامەزراندووە. هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی ئەندامێکی چالاک بووە. پاشان لەگەڵ دامەزراندنی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردیدا ئەندامێکی چالاکی دامەزرێنەری ئەو تیپە بووە. یەکێک بوو لەو هونەرمەندە بەهەڵوێستانەی کە لە سەردەمی خەباتی نهێنیدا، لەگەڵ دەستەیەک هونەرمەندی شاری سلێمانیدا کۆمیتەی شاری یەکێتیی هونەرمەندانی کوردستانیان دامەزراندووە. لە سەردەمی ڕژێمدا بەرپرسی بەشی شانۆی یەکێتیی هونەرمەندانی کوردستان بووە. بۆ چەند دەورەیەک تا کۆچی دوایی کرد، سەرۆکی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی بووە. لەسەر دەستی ئەودا تیپەکە لە ڕووی هونەرییەوە گەشەیەکی تەواوی کردبوو، چەندین بەرهەمی ناوازەیان پێشکەشی جەماوەر کرد، کە دواهەمینیان شانۆگەریی "ئەحەی کڕنوو" بوو. لەگەڵ دانانی یەکەم بەردی بناغەی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی دڵسۆزی تردا ماندوونەناسانە کاری کردووە. ماڵی هونەرمەند "عوسمان چێوار" یەکەمین ستۆدیۆی تۆمارکردنی بەرهەمەکانی تەلەفزیۆن بووە. لە کاتێکدا هێشتا دامودەزگاکانی ڕژێم لە ناو سلێمانیدا بوو. هەر لە سەرەتای بەرنامەی کەشکۆڵەوە ئەندامێکی کارا و چالاکی بەرنامەکە بووە. ئەندامی لیژنەی سلێمانیی ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان بووە. ئەندامی کۆنفرانسی کوردۆلۆجی بووە لە زانکۆی سلێمانی. تا وادەی کۆچی دوایی بەرپرسی بەشی وەرگێڕان، فیلم، بەڵگەنامە و مێژوو بوو لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان. لە بواری سینەما و درامای تەلەفزیۆنیشدا دەستێکی باڵای هەبوو، دوافیلمی بە ناوی "بەهەشتێکی سووتاو"وە بەرهەم هێناوە.

لە ڕێکەوتی ١٩٩٦/٥/٢١ لە کاتی بەئەنجامدانی کارەکانیدا لە تەلەفیزیۆن، دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت. هونەرمەندی کۆچکردوو هەمیشە مامۆستایەکی دڵسۆز و ڕێنیشاندەرێکی بەئەمەک بووە بۆ گشت ئەو هاوڕێ هونەرمەندانەی کە لەگەڵیدا کاریان کردووە. لە دوای خۆی پێنج منداڵی بەجێ هێشتووە: "کاڵێز، کاردان، دالیا، ڕەنجدەر، کۆسار".

# بۆ عوسمان چێوار

## شێرکۆ بێکەس

- ١ -

پەڕەسێلکەی هەواڵێکی ڕەش و سپی..
تێکەڵ لە بەفر و نامۆیی
تەڕ تەڕ وەکوو چاوی "گۆیژە"
بەرەو ڕووم دێ و نزم ئەفڕێ و
ناوبەناوێ بەرسنگ ئەدا لە مەراقم و
جاربەجارێ باڵێک ئەدا لە ئەستێرکی حەپەساوم و
چون قەسیدەی پرسەدارم..
ئەویش ئەگری و ئەگری!
پەڕەسێلکەی هەواڵێکی ڕەش و سپیی..
پەڕەسێلکەی شانۆیەکی سلەیمانی
تێکەڵ لە ڕەنگی کراسی گەرمیان و
تێکەڵ لە زیوی تریفە و گەڵای قۆپیی

بەرەو ڕووم دێ و نزم ئەفڕێ و
ناوبەناوێ دەنووک ئەدا
لە پەنجەرەی شەختەی ژوورم و
جاربەجارێ سەرئەکێشی بە: وشەمدا و
لە دواییشدا ئەویش وەکوو قەڵەمەکەم
سەردائەخا و
بە کوڵ ئەگری و ئەگری و ئەگری..!
--پەڕەسێلکەی هەواڵێکی ڕەش و سپیی..
بەرەو ڕووت دێ و نزم ئەفڕێ و
هەر خول ئەخوا بە چواردەوری تەنیاییتدا و
باڵ جووت ئەکا و ئەیکاتەوە و..
تۆیش لەولاوە درەختی دوورگەی فرمێسکی
باڵای شانۆی گوڵ عومەری و
هەڵ ئەوەری!.
ئەی پەڕەسێلکەی هاوڕێ!
ئەی باڵەکانی فرمێسکی ڕەش و سپیم!
ئەی خەمی نوێی هەڵفڕیوی نێو شارەکەم!
بۆ کوێ ئەڕۆی؟! بۆ کوێ ئەفڕی؟!
ئەوە سەرم و ئەوە پووشووی زەردی قژم و هێلانەکەت!
ئەوە کونە زامی سنگم و کونە ئاخ و کونە داخ و
گەرمەسێری جریوەکەت!
بۆ لائەدەی؟! بۆ کوێ ئەفڕی؟!
تۆ هەنسکی ڕەش و سپیی شانۆی منی
بۆ لائەدەی؟! ناسینەوەم
لە ناسینەوەی گومەزی سەر سەیوان و
دۆزینەوەم، لە دۆزینەوەی هاواری مامەیارە و
"ژیانی ڕۆژانە"ی خۆت و

پێڵاوەکەی "ئەحەی کوڕنوو" ئاسانترە!
بۆ لائەدەیت؟! ناونیشانم
لە ناونیشانی هۆڵەکەی - هونەرمەندان -
لە مەزارەکەی "ماجید" و
لە ماڵە ڕووتەڵەی "چێوار" ئاسانترە!
بۆ لائەدەی؟! بۆ کوێ ئەفڕی؟!
من لەم ناوە، لەم بەفری قوتبە شینەدا
نوێنەری گشت گریانێکی پەردەی شانۆ و
نوێنەری کۆچی دەنگتانم.
من لەم ناوە، سنووقی پۆستی زایەڵە و
هەر بۆ خۆیشم، من پۆستەچی نامەی کۆست و
بۆ خەزانی ئاوێنەکانی سەر شانۆیش:
ئەدرەستانم!.
ئەی پەڕەسێلکەی هاوڕێ!
بۆ خول ئەخۆی بە دەوری ئەم:
بەفرە شینەی سەری مندا؟!
وەرە و گریان دەروازەکەی کراوەیە و
قوڵپی تازە و کوڵی تازە و
شانۆنامەی ئەم کۆتەڵە نوێیەم بەرێ!
ئێوارە مەراقی زەردەبوو، دائەهات.
خۆرنشین بە بۆنی بادەوە ئەگەیشتە بەردەمی چایخانە.
چەند شیعر و چیرۆک و شانۆیەک، لەوێدا ئەبووینە درەختی،
تۆزاوی و چاوەڕێی سەر جادە. چایخانە ئەکەوتە،
باوێشکدان، سەماوەر ئەنووست و کورسییەکان ئەنووستن و
"عەبدوڵڵا جەوهەر"یش هەڵئەسا. ماخۆلان ئەسپ بوو،
ئەسپەکەی "بێکەس" بوو، لە گیانی ئێمەدا بۆ عارەق،

بۆ ڕەشی بۆ سپیی، ئەیکردە کوڕژن و سمکۆڵان.
وەختی نوێژ بۆ عەشقی شیعرێک و شانۆیەک هاتووە.
وەختی نوێژ لەبەردەم خواوەندی بادەدا هاتووە.
ئەهاتیت. خەونێکی شانۆ بوویت ئەهاتیت. نەورەسی
"چیخۆف"ی غەمگین بوویت، بە کاوخۆ ئەهاتیت.
کراست هەورێکی چرچ و لۆچ، پانتۆڵت تیزماڵکی
دووکەڵ بوو، ئەگەیشتیت. سەروقژ هێلانەی باڵندەی
بێزاریی. ڕوخسارت چون مێژووی شارەکەت،
چون نانی گریاوی هەژاریی. تەمتوومان لە چاوتا
وەک خانوە قوڕەکان، مەیدانی کافرۆش، گەڕەکی
مەڵکەندی، پڕی بوو: لە کۆچی بێ وادەی جریوە و،
لە هەوری سەرگەرداں. ڕوخسارت: حەوزێکی پرشنگ بوو،
بۆ ماسیی ڕەنگاڵەی هونەر و، شەوێک بوو، بۆ عەشقی
نێوانی شانۆت و ئازادیی. ئەهاتیت:
- خاڵە گیان! با بڕۆین! تۆ ئەتوت.
- خاڵە گیان! بۆ نەڕۆین! من ئەموت.
ئەڕۆیشتین سەرەوژوور، زریزەی خەمێک بووین.
هەر هەمان - کۆمەڵی نەگبەتی بێکەس بووین -
سەرەوژوور ئەڕۆیشتین.
بازنەی چەند چرای سەرخۆش بووین
بە دەوری مێزێکی شان گێڕدا!
فەقیانە و جامانەی مامۆستا (عومەر) و فۆلکلۆر،
منارەی سەرمێزی ئێمەبوو. دووکەڵی جگەرە و شیعرێکی
تازەی من. دەورێکی تازەی تۆ. بە چرپەیش هەواڵی
سووربـاوی ڕەوەز و کەوێڵی هەڵۆکان. لاقرتێی
ناو قاقای (شێرزاد) و ڕاوەکە و میاومیاوی پشیلەی
ژێر مێز و، پێکێکی ڕژاو و، تارمایی مولازم موحسین و،

دوا ناوی شەهید و، درەنگان چریکەی فڕیوی ماملێی
(بێگەرد) و.. ئەمانە هەر هەموو بەیەکدا ئەهاتن و
سەریشمان گومەز ئەبوو لە تەمی مێژوودا و
باڵامان نوقمی ناو دەغڵی دواڕۆژ و
بینینمان.. بینینی ڕووبار بوو
ئەوکاتەی مل ئەنێ بۆ دنیای نادیار و بۆ زەریا.
- بەتەماتم، خاڵە چێوار! هۆ مامە شێخ، بەتەماتم!
ئەمشەو لەم قوتبە شینەدا
لە بەفری ئەم غوربەتەدا..
ببیتە شانۆی باڵدار و بێی بۆ لام و سەردانمکەی!
بەتەماتم.. بەڵام پاڵتۆ دڕاوەکەت "کە شەوێکیان
داتە بەر شەق" لەبیرنەچێ!. کڵێتەکەت "کە
شەوێکیان کردتە سەری (خاڵە شەمۆ) " لەبیرنەچێ.
بەتەماتم هەر خۆیشم نیم، هەر "چوار پیاوی ئوتێلەکە"
بێجگە لە خۆت، ئەحەی کوڕنوو و بێ پێڵاو و،
"دڵشاد"یشمان بێ چاویلکە لەگەڵدایە!.
باوبۆرانە و وژەوژی خەستانە و
ئەمشەو لەم قوتبە شینەدا بەتەماتم ئەبێ هەر بێیت.
بادەی پەرداخەکەی (بێکەس) کە لە بنیا
کسپەیەکی مۆر ئەلەرزێ.. چاوەڕێتە!
مۆمێک بە بەرزیی باڵای هونەرت و
بەرزیی باڵای شانۆی "پێشڕەو"
ئەسوتێت و چاوەڕێتە!.
سەرم هێلانەی تۆ نییە؟!
بۆچی خۆتم لێ ئەگۆڕی! تۆ چێوار نیت؟!
تۆ کوڕی شانۆی هەژاری شارەکەم و
ئەکتەرە هەوری هونەر و

مامزێکی ڕووت و برسیی
دەشتی خەمی شارەزوور نیت؟!
بۆچی خۆتم لێ ئەگۆڕی!
تۆ چێوار نیت؟!
تۆ سیناریۆی ئازارێکی بەردەوام و
دیالۆگی نێوان عەشق و خۆرەتاو نیت؟!
بۆچی خۆتم لێ ئەگۆڕی!
ئەی تۆ تەختەی شانۆت نەکرد
بە عەرشی بەرزی مەرگی خۆت؟!
تۆ خۆت نەکرد بە پلووسکی بەردەم خەڵک و.. تینووشت بوو؟!
تۆ خۆت نەکرد بە نانێکی بەردەم خەڵک و.. برسیشت بوو؟!
ئەی تۆ نەبووی
لەبەر پێکانی شانۆدا و
لە سەرە ڕێی شەوانێکی بێ چرادا
بۆئەوەی (ئەو) هەڵنەنووتێ و نەکەوێت و
بڕواوبڕوا.. باڵەکانت دانەگیرسان؟!
بێدەنگی و ترست نەسووتان؟!
دە پێم بڵێ! دە پێم بڵێ! دە پێم بڵێ!
تۆ چێوار نیت؟!
"پەڕەسێلکە هاتە پێشێ و
لەژێر بنمیچی شیعرێکما
کز کز هەڵنیشت.
منیش.. سووک.. سووک..
قەفەزی سنگم کردەوە و
چووە ناوی و
لە ڕۆحما نووست!"..

**ساڵی ١٩٩٧ نووسراوە**

# چێوار تاڤگەی بەرزهەڵچووی هەست و هونەر

ئەحمەد سالار

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی لە سلێمانی، ژمارەیەک گەنجی خوێنگەرم ڕوویان لێکرد و بەشداریی چالاکییەکانیان کرد. لەو دەمەوە کاکە (عوسمان چێوار)م ناسی. دیارە لە یەکەم هەنگاوی بوژاندنەوە و سەرهەڵدانەوەی بزاڤی شانۆی کوردی لە کۆتایی شەستەکانەوە، ژمارەیەک چالاکیی شانۆیی چ لە پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایان و چ لە ئامادەیی سلێمانیی کوڕان هەبوون. یەکێک لەو گەنجانە کاک چێوار بوو، کە بزوێنەری ئەو چالاکییەش مامۆستا (عەبدولقادر نوری) بوو. سەرەتا بە شانۆیی (بڕیار و ئەنجام)ی مامۆستا (ئەمین میرزا کەریم) بوو، کە لەساڵی (١٩٦٨) لەسەر شانۆی ئامادەیی سلێمانیی کوڕان پێشکەش کرا، یەکێک لە ئەکتەرە دیارەکانی کاک چێوار بوو. لە ژمارەیەک لە بەرهەمەکانمدا وەک ئەکتەرێکی دڵسۆز و بەهرەمەند بەشدارییەکی جوانی کردووە. لەو شانۆییانەی ئەو کاتە شانۆیی (ئۆتۆمبێلچی) نووسینی (ئەمینی میرزا کەریم)، شانۆیی

(پێنج کەس لە ئوتێلێکا)ی (ستیوارد روی) کە هەر لە وەرگێڕانی خۆم بوو.
هەروەها لە (تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی)، کە لە ١٩٧٣/٧/٢١ دامەزرا، لە دامەزراندنییەوە ئەندامێکی هەرە دیار بووە و لەم کارانەی مندا ئەکتەر بووە: وەک (ڕەجەب و پیاوخۆران)ی (سمکۆ ناکام) کەسایەتیی (یوسف)ی دەنواند. هەروەها وەرگێڕی شانۆیی (ئابڵووقە)ی (عادل کازم) کە بەرهەمێکی دووقۆڵیی تیپی سلێمانی و پێشڕەو بوو، مامۆستا (غازی بامەڕنی) دەرهێنەری بوو. لە شانۆیی (خەج و سیامەند)ی (فوئاد مەجید میسری) بە هاوبەشیی شانۆی زانکۆ جگە لەوەی ئەکتەری سەرەکیی بوو و کەسایەتیی (سیامەند)ی دەنواند، هەروەها یاریدەدەرم بوو. هەر کاکە (عوسمان چێوار) لە شانۆیی (لالوڤانیا)ی (چیخۆف)، کە لە دەرهێنانم بوو، جگە لەوەی کەسایەتیی (ڤانیا)ی دەنواند، هەروەها دیکۆرکێشی بەرهەمەکە بوو. ئەم شانۆییە لە ڕۆژانی (٢/٢ تا ١٩٨٠/٢/١٩) لەسەر شانۆی سەلاحەدین نوێندرا. ئەم کارە لە دەرهێنانەکانم بوو، (کاک عوسمان چێوار) سەرکەوتووانە کردبووی بە کوردی و توانیبووی گیان و مەبەستی نووسەر بە جوانی بگەیەنێ.
لە میهرەجانی یەکەمی هونەری کوردی، کە میهرەجانێکی سەرانسەریی باشووری کوردستان بوو، لە (٢/٢٥-١٩٧٤/٣/١) لە بەغداد لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیریی کوردییەوە ساز کرا، لەو کارەمدا (چێوار) کەسایەتیی کرێکاری یەکەمی دەنواند لەگەڵ نواندنی هەقایەتخوانی ژمارە (١). بەرهەمەکە پتر جەختی لەسەر جووڵەی خێرا و ڕزمدار کردبوو، لە کاتی پرۆڤەکاندا گەلێک بیرۆکەی جوانی دەخستە ڕوو، کە خزمەتێکی باشی کارەکەی کردبوو. بە کورتییەکەی، هونەرمەندی خوالێخۆشبوو، پانتاییەکی بەرینی لە ژیانی هونەریمدا هەیە و هەمیشە لە زەینی ئەو گشت ساڵەدا بە زیندوویی و گەشاوەیی ماوەتەوە، لە زۆر شتی جوان

و هەستبزوێندا دەیبینمەوە، ڕۆژانی پرۆڤەی شانۆیی و لە گەشتە هونەرییەکان و لە ئێوارانی دوایی ئەو ماندووبوونانەی، کە کەڵکەڵەی سووربوونی لەسەر هونەر پێمان دەبەخشیٚ و یادەوەریی سەردەمی شەوان، کە جگە لە باسی هونەر و سیاسەت، قسەی خۆش و هەمەجۆر باس و خواسی ئەو تەمەنەمان، زۆربەی ئەو شەوگارانەمان بە هاوەڵیی کاکە عوسمان و کاکە مستەفا ئەحمەد و کاکە ئازاد حەمە بچکۆل و خوالێخۆشبوو کاکە کەمال سابیر و کاکە شەماڵ شێخ جەمال ئەبردە سەر. پەیتاپەیتا کاکە چێوار قسە تەنزئامێزەکانی دەکرد و بە قاقالێدانیان یانەکەی دەهەژاند.

هەر لە دوو توێی یادەوەرییەکانمدا لەگەڵ کاکە چێوار، ئەوە بوو پاش نەمان لە تیپی پێشڕەو، چەند ساڵێکی بەسەردا ڕابوردبوو، دەمەوعەسرێک لە ماڵی خۆمانەوە لە (تووی مەلیک) بە شەقامەکەدا ئەهاتمە خوارێ، کاتێ گەیشتمە بەر بارەگای تیپی پێشڕەو، کە لەو ژێرزەمینەدا بوو و بە شانۆی گیرفانئاسا یان گچکە شانۆیان کردبوو، بەبێ ئەوەی ئاگادار بم، لەپڕا مەیلێکی گەرمی سەردانیانم کرد. کاتێ چوومە خوارێ، بەسەر کۆبوونەوەی هەڵبژاردندا چووم، کاکە چێوار دەستەوملانم بوو، بە پەرۆشەوە پێشوازیی لێکردم و بە دەنگی بەرز تکای لێکردم: ئەوا خوا ناردی، ئێرە هەر ئەو تیپەی خۆتە، کە دامەزرێنەری بوویت، ئێستاش بە سەرۆک هەڵتدەبژێرینەوە.

– زۆر سوپاس کاکە عوسمان، پیرۆزبایتان لێئەکەم لە خوام داوایە هەر سەرکەوتوو بن.

کاکە چێوار کۆڵەکەی بەهێزی ڕاگری تیپەکەبوو، هەمیشە لە هەوڵی پێشکەشکردنی بەرهەمی چاکتردا بوو، هونەرمەندێکی ماندوونەناس بوو، دەبێ کاتێ یادی ئەو ئازیزە خوالێخۆشبووە بکەین، لایەنی هەست و سۆزی بەهێز و پتەوی نەتەوەپەرستییەکەی وەلاوە نەنێین، ئەوەبوو لە زۆر لەو ڕۆژانەی نەهامەتیدا، هێندە پیشی پڕ لە حەسرەتی ئەبردەوە، سینە و دڵی پێوەی ئەتلایەوە، تووشی جۆرە هیستریایەکی بەهێزی ئەکرد، ئەوە بوو چەند جارێ لە بەردەرکی سەرای چەقی شاردا سینەی دائەدڕێ و بە دەنگی بەرز هێرشی ئەکردە سەر ڕژێم و داخی دڵی پێ ئەڕشتن. لە کۆتایی ئەم چەند ڕستەیەدا ئەڵێم: براکەم؛ کاکە عوسمان چێوار؛ تاڤگەیەک بوو لە هەست و هونەر و هۆشیاری، یادی بەخێر.

چێوار
ڕۆژگار

# چێوار و ئەزموون

## دیدێکی خێرا بۆ لایەنی کەمی کاریگەریی عوسمان چێوار لەسەر یادەوەریی بزووتنەوەی شانۆیی کورد

**دڵشاد مستەفا –بریتانیا**

بەر لەوەی ئەو قۆناغە بێتە گۆڕێ، کە لە ئەدەبیاتی ڕەخنەیی سەدەی ڕابردوو و بەتایبەتیش لە هەشتاکانیدا بە قۆناغی زێڕینی بزووتنەوەی شانۆیی کوردستان ناو دەبرێت (کە تا ئێستا ئەو دیبەیتە یەکلایی نەبووەتەوە)، کۆمەڵێک فاکتەری سەرەکی هەبوون بۆ ڕسکانی ئەو فینۆمینە و دواتریش بەردەوامبوونی. هاتنەکایەی کۆمەڵێک توانای جیاواز بە هەناسەیەکی جیاوازەوە و دامەزراندنی تیپێکی شانۆیی بۆ کۆکردنەوەیان یەکێکە لەو فاکتەرانەی ناکرێت نادیدە بگیرێت.

تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی، کە واتای ناوەکەی لە کارەکانیدا بەرجەستە دەکات، ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەی

خەونی جیاوازبوون کۆیان دەکاتەوە و
دەیانەوێت شانۆ بکەنە بەردەبازی دە
لەو ئەوقەی کە هەرەسی شۆڕش
ساڵی ١٩٧٥دا کردبوویە دیفاکتۆ.
نسکۆی شۆڕش ئەو دیاردە ز
مێژووی ئێمە، کە لە دەرەوەی کا
کەمترین قسەی لەسەر کراوە
توێژینەوە لەمەڕ لێکەوتە س
سۆسیۆلۆژییەکانی ئەنجام دراو
گەورەی لەسەر تەواوی جوم
کۆمەڵی کوردی جێ هێشت. ل
خۆیدا وەک کارەساتێکی مەزن د
کە زەینی خۆڕسکی کوردی بۆی
بۆیە شۆکێکی دەروونیی گەورە
تاکی کوردیدا دروست کرد.
ئەو دۆخە دەبوو لە نێوەندە ئەدە
و ڕوناکبیرییەکاندا بە شێوە
بەرجەستە ببێت. بۆیە ژمارەیەک
هونەرمەند ئەو ئەرکەیان لە ئەستۆ گرت و بوونە پێشڕەوی ئەو کاروانەی کاری هێنانەگۆی ئەو بێدەنگییەیە، کە دنیای کوردی داپۆشیووە.
لە نێوەندی هونەریدا تیپی شانۆی پێشڕەو، کە خۆی لەدایکبووی قۆناغی شۆڕشە، هەوڵەکانی دەست پێکرد و جارێکی دی لە ڕێی نمایشی شانۆوە کەوتە زیندووکردنەوەی گیانی ژیاندۆستی و بەرخودان. ئەو گروپە لەوە دڵنیا بوون، کە تاکی کۆمەڵی کوردی پێویستی بە جۆرێکی تر لە هۆشیارییە تا کۆمەکی بکات لە بەرەنگاربوونەوەی فشارە دەروونییەکانی و دواتر دەربازبوون لەو دۆخی نائومێدییەی باڵی بەسەر پانتایی گشتیدا کێشابوو.
هەڵبەتە ئەو هاوڕێیانە ڕستێک کەسی شارەزا و ڕوناکبیر بوون، کە پێکرا نموونەی کەسانی هۆشیاری سەردەمی خۆیان بوون (ئەحمەد سالار، دڵشاد مەریوانی،

ی
ۆژانەی
ی ئەوەدا بوو
شانۆ ئەو ئەرکە کۆمەڵایەتییەی ڕاپەڕێنێت، کە لە ئەزموونی شانۆکانی تری دنیا و لە دەرەوەی بازنەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەیکات. هەڵبەتە شانبەشانی چێوار، ئەوانی دییش بە هەناسەی درێژ و ئارامییەوە بەشداریی ئەو پرۆسەیەن و ماندووبوونی ئەوانیش شایستەی لێوردبوونەوەیە، بەڵام ئەرکی ئەم نووسینە هێنانەگۆی توانا و پێگەی چێوارە لە نێو بزووتنەوە شانۆییەکەی کورددا و ڕوانینە لە هەندێک ئەزموونی ناوازە، کە دەتوانن چێوار لەوانی دی جیا بکەنەوە. بە مانایەکی دی، ئەو ئەزموونانەی تایبەتمەندیی چێوار وەک دەرهێنەرێکی هۆشیار دەسەلمێنن.

## چێوار و کوردبوون

بۆ چێوار کوردبوون هەر ئەو مانا تەسکە ناگرێتەوە، کە سیاسەت پێی دەبەخشێ، هەرچەندە لەو دۆخەشدا درێغی نەکردووە، بەڵکو ئەو دنیایەکی تر بەو دیدەی خۆی ئاوەدان دەکاتەوە.

ئەو بە شوێن کوردبوونەوەیە وەک کەرەستەی بەرهەم و دواتر هەوڵی بنیاتنانی گوتارێکی کوردانە لە ڕێی هونەرەکەی خۆیەوە دەخاتە گەڕ. چێوار کوردبوون لە فۆرمێکی تردا ئەزموون دەکات و بە شوێن ئەو فاکتەرەوەیە، کە دەتوانێ ببێتە پاڵپشتێکی بەهێز بۆ هەوڵەکانی.

هەرچەندە بەر لە ئەزموونەکانی چێواریش شانۆی پێشڕەو مامەڵەیان لەگەڵ دەقەکانی سمکۆ ناکام کردووە، وەلێ چێوار ستایلێکی تر لە کارکردن بەو تێزانە دەدۆزێتەوە. وردترین مامەڵەی چێوار لە ئەزموونی (گوڵعومەر) دا بەرجەستە دەبێت.

ناکام مێژووی سیاسیی سلێمانی بە زنجیرەیەک ڕووداوی مێژوویییەوە گرێ دەدات و لە نێویاندا چیرۆکی ئازایەتی و بەرخودانی کورد دەکاتە بەشێک لە وێناکردنی ئەو قۆناغە مێژوویییە جیاوازانە. چێوار دێت و لە کەشێکی تەواو دروستدا بەرهەمی دێنێ. دروستکردنی پانتاییەکی گونجاو و خوڵقاندنی ئەتمۆسفیرێکی تەواو تەبا لەگەڵ ئەوەی لە دەقەکەدا هاتووە بە زیادکردنی کاراکتەرێکی دی، کە بەردەوام لە پشت هەموو ئەو ڕووداوانەوە کار دەکات و ئەو تەونی هەموو ئەو کێشانە دەچنێ و ململانێکان دەخوڵقێنێ و کەی بخوازێت، کۆتاییان پێدێنێت. هەڵبەتە ئاماژەکانی نمایش بە گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمە مێژوویییەی لێی دەدوێت، بە سانایی ئەو کاراکتەرەمان پێدەناسێنێت، کە مێجەرسۆنی نوێنەری بریتانیایە و ئەو بەرپرسە لە هەموو ئەوەی دەگوزەرێ و تەواوی ڕووداوەکان وەک ئەوە ڕوو دەدەن، کە ئەو پلانیان بۆ دەکێشێ. هەڵبەتە لەمێژە ئەوە بڕوایەکی جێگیری کورد بووە، کە نەتەوەیەکە قوربانیی دەستی ئەو پلانەیە، کە لە دەرەوەی ناوچەکە بۆ بەڕێوەبردنی یارییە سیاسییەکانی ناوچەکە دادەنرێت. تا ئەمڕۆش ئەو گریمانەیە ڕاستە، کە تاکی کوردی بە سیاسەتمەدار و بیریار و شرۆڤەکار و هەموو ئەوانی ترەوە نازانن چارەنووسی سبەینێ چییە و هەموو چاوەڕوانی پلانەکەن، کە ئەو کاراکتەرە خەریکی چنینێتی. چێوار ئەو حەقیقەتە تاڵەی لە گوڵعومەردا بەیان کرد. ئیدی کۆدەکانی نمایش کە بەو باکگراوندە بەراورد دەکرانەوە، ساناتر لە لای وەرگر ڕاڤە دەکران.

چێوار، بە پێچەوانەی زۆرێک لە دەرهێنەران، لەگەڵ جۆرێکی تر لە کارکردن ڕایهێنایین... سادە و پڕ واتا، دەشێت ئەو دۆخە بە زاراوەی (سهل الممتنع) ناو بەرین.. ئەوەی ئەو دەیخوڵقێنێ، سانایە، بەڵام ساویلکە نییە، سادەیە بەڵام سووک و بەردەست نییە. بینەر دەتوانێ بە سادەیی خۆیەوە شتێک لە پەیامەکە وەربگرێت، بەڵام، نالی وتەنی، هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالبی مەعنا دەکات. ئەوە ئەو ستراتیجەیە، کە چێوار دەیکێشێ و ساڵانێکی زۆری کارکردنی تا دواکاری لە (ئەحەی کرنوو)دا لەسەری بەردەوام بوو.

هەڵبەتە (گوڵعومەر) جگە لە باکگراوندە سیاسییەکەی، کارێکی ناوازەش بوو لەسەر دۆخی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵی کوردیی ڕۆژگاری خۆی و هەموو ئەو ململانێ و کێشانەشی بە شێوەیەکی دروست بەرجەستە کردبوو. هەڵبژاردنی کات و شوێنی نمایش بەردەوام بەشێکی ترن لە زەینی چێوار. ڕاستە لەو دۆخەدا شانۆی پێشڕەو بۆ خۆیان شانۆیەکیان دروست کردوو، ئیدی پێویستیان بە شوێنی تر نەما بۆ کارەکانیان، وەلێ ئەو شوێنە کە لە ژێرزەمینێکدایە، هێندەی تر لە ڕاژەی ئەو هەڵکۆڵینەی ڕابردوودا بوو، بۆیە لە هەموو دۆخەکاندا ئەو دەتوانێ ڕێچکە دروست و پڕ ماناکان بۆ بەرهەمەکانی هەڵبژێرێت.

ئەزموونی (ئەحەی کرنوو) یەکێکی ترە لە ئەزموونە ناوازەکانی چێوار لەو جۆرە پۆلێنەدا. ئەم جارەیان کەرەستەی بەرهەم کۆکراوەی هەوڵ و ماندووبوونی خودی چێوارە. ئەو بە نێو مێژووی سلێمانیدا دەچێتەوە و لەوێوە خەونی کاراکتەرێک زیندوو دەکاتەوە، کە بە یەکێک لە پایە گرنگەکانی سەرەتاکانی ئاشنابوونی شار بە هونەری نمایش دادەنرێت.

ئەحەی کڕنوو، ئەو پیاوەی خەونی پاڵەوانبوون وەک دۆن کیشۆتی سەردەمی خۆی بەرەو گیانبازی دەبیات؛ ئەو کە لە ژیانی ئاسایی خۆیدا ناتوانێ پاڵەوانێکی نەتەوەیی بێت، دەخوازێت لە ڕێی نمایشەوە ببێتە پاڵەوان. بۆیە بۆ هێنانەدیی ئەو خەونە کاراکتەری (عەولە سیس)، پاڵەوانە قوربانییەکەی ڕووداوەکانی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠، نمایش دەکات و دەیەوێت لەڕێی ئەوەوە مانایەکی تر بدات بە ژیانی خۆی. هەڵبەتە قسەکردن لەسەر ئەو کردەیە جگە لە خەونی پاڵەوانبوون، قسەکردنە لە حەقیقەتێکی تاڵی نێو کۆمەڵی کوردییش، کە پێگەی هونەرمەند لە نێویدا لەو ئاستەدا نییە، کە وەک نموونە تەماشا بکرێت. بۆیە ناچار دەبێت بۆ دانی ئەو پێگە شایستەیە خۆی بکاتە پاڵەوانێکی قوربانی.

چێوار لەگەڵ ئەوەی تا سەر ئێسک شەیدای کوردبوونە، وەلێ بێ ڕەخنەش جێی ناهێڵێ، چونکە ئەو کاریگەریی هونەرەکەی لە ڕۆژگاری خۆیدا دەزانێ و تەواو لەوەش بەئاگایە کە ئەگەر بە شێوە دروستەکەی لە ڕاژەی خەڵک بەکار نەهێنرێت، ڕەنگە ببێتە ئامرازێکی ترسناک و لە دژی بەکار بێتەوە. بۆیە دەستبردن بۆ وروژاندنی چەمکی پاڵەوان و کورتکردنەوەی لەو مانا تراجیدییەدا جارێکی دی ئەوەمان بە بیر دێنێتەوە، کە بەشی زۆری کورد خەونی بە پاڵەوانبوونی لە قوربانیداندا دەبینێت. بۆیە هەمیشە لە بەردەم تەواوی دنیادا سەرقاڵی نمایشی برینەکانمانین و هۆشیاریمان بە برین هۆشیاریی قوربانییەکە، کە خەون بە پاڵەوانبوونەوە دەبینێت.

ئەو ئەتمۆسفیرەی نمایشی پێدا دەبات، هەوڵی جارێکی دی بەئاگاهێنانەوەی ئێستایە لە ڕێی بزواندنی یادەوریی ڕابردووەوە. ئەوە جۆرێکی تر لە هۆشیارییە، کە تۆ بتوانی لە ڕێی نمایشی چیرۆکەکانی ڕابردووەوە ئێستا بهێنیتە گۆ، ئەو پرۆسێسەی کەم کەس دەتوانێ تێیدا سەرکەوتوو بێت. هەڵبەتە تەواو کارکردن نییە لە شانۆی دۆکیومنتیدا بەو مانایەی (پیتەر ڤایس) کاری لەسەر کردووە، بەڵکو جۆرێکی تر ڕوانینە لە مێژوو لە ناو خۆیدا و دواتر بانگهێشتکردنێتی بۆ ئێستا. ئەو ڕابردوو دادگایی ناکات هێندەی ئەوەی وەک فاکتەری خوێندنەوەی ئێستا سوودی لێدەبینێت، ئەو ئێستا نمایش ناکات هێندەی ئەوەی وەک خوێنراوەیەک لە ڕێی ڕابردووەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکات.

هەڵبەت پەنابردن بۆ کۆمیدیا بۆ بەخشینی ئەتمۆسفیرێکی تر بە نمایش یەکێکی ترە لەو ستراتیجانەی چێوار زۆر دروست و هۆشیارانە مامەڵەی لەگەڵ دەکات و کەم دەرهێنەر لە مێژووی بزووتنەوە شانۆییەکەی کورددا توانیویانە پەی پێبەرن.

## چێوار و عەزیز نەسین

نووسەری گەورەی تورک، عەزیز نەسین، بە یەکێک لە دیارترین نووسەرانی قۆناغی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو دەناسرێ. ئەو، وەک خۆی دەڵێ، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوو فرمێسکەکانی خۆی بکاتە خەندە بۆ سەرلێوی خوێنەرانی. نەسین لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا یەکێکە لە ڕێبەرانی کۆمیدیای ڕەش. ئەو ستایلەی نووسەرانی خۆرهەڵات لەپێناو دەربازبوون لە چاو و مقەستی سانسۆر پەنایان بۆ دەبرد و لە ڕێی ئەو ستایلەوە دەیانتوانی کەموکورتی و قەیرانەکان، ڕەوشی نالەباری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی پیشان بدەن.

هەمان ئەو فاکتەرانەش چێواری بردە لای نەسین. چێوار لە (مرۆڤ و شارەکەی)دا لە ڕێی کۆمیدیاوە و بە ناوی قسەکردن لەسەر کۆمەڵگەی نەسینی تورک لەو هەموو نەهامەتییە دەدوا، کە کۆمەڵی ئەو سەردەمەی عێراق بە گشتی پێیدا تێپەڕ دەبوون. ئەو لەو ئازار و برینانە دەدوا، کە

نەدەکرا هەروا لامسەلایی لێیان بڕوانێ و هیچیان دەربارە نەڵێت. بۆیە باشترین دەرباز پەنابردنە بەر کۆمیدیا و قسەکردنە بە ناوی کۆمەڵگەی (ئەو)ەوە، ئەوی تورک یان هەر کۆمەڵێکی تر. چێوار لە ڕێی بەکاربردنی ستایلێکی ساناى مامەڵەکردن لەگەڵ دیکۆر و پانتایی و مامەڵەکردنێکی هۆشیارانە بە هەندێک کەرەستەی سادە بۆ گۆڕینی خێرای دیمەنەکان، سەلیقەی دەرهێنەرێکی شارەزای بە سانایی پێدەگەیاندین. ئەو دەیزانی بینەری کورد بێئارامە و دەیەوێت بە خێرایی ئاکامەکان وەربگرێت، بۆیە لەگەڵ ئامادەکاری دەقدا پێکەوە ڕیتمی خێرای ڕووداو و گۆڕینی دیمەنەکان لە کاتی گونجاو و تەواوکردنی هەر چیرۆکێک لە دیمەنێکدا یان لانی کەم بەخشینی ئاکامێکی ڕازیکەر بە زوویی وەک تەکنیکێکی سەرکەوتووی ڕۆژگاری خۆی بەکار دەبرد. هاوکات لەگەڵ ئەوەدا سوودێکی زیرەکانەی لە تەکنیکەکانی شانۆی داستانی بینیبوو، بەتایبەت مەسەلەی لابردنی دیواری چوارەم بۆ تێکەڵاوکردنی بینەر بە کەشی نمایش و تەنانەت گواستنەوەی هەندێک دیمەن بۆ ناو بینەران و بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی بینەر بە ئەکتەرەکان {ئەوە کردەیەکی باو بوو لەو ڕۆژگارەدا بە مەبەستی پەیڕەوکردنی ئەو تەکنیکەی شانۆی داستانی، هەرچەندە ئەو دیاردەیە قسەی زیاتر هەڵدەگرێ، بەڵام لێرەدا دەرفەتی ئەوە نییە و گەر تەمەن ڕێ بدات، بۆ نووسینێکی تر}. چێوار بە پەنابردن بۆ ئەو جۆرە تەکنیکە ئاماژەیەک بەرەو زەینی وەرگر دەنێرێت و دەڵێت هەرچەندە ئەوەی ڕوو دەدات باس، لە تورکیاکەی نەسین دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا باسی ئێرە و ئێستا دەکەین و ئەوەتا تۆش بەشداری لە گێڕانەوەی چیرۆکەکاندا، ئەوەتا تۆش نەفەری ئەو پاسەیت، کە لە چیرۆکەکەی نەسیندا بێ تەگەرە ناگاتە جێی خۆی. لە دیمەنەکانی تریشدا ئەوەتا کەسێک (ئەکتەرێک) لە پەنا تۆدا هەڵدەستێ و بەشداری لە گفتۆگۆکاندا دەکات و دەرفەتی تۆش دەدەین،

گەر بتەوێت، قسەی خۆت بکەیت و هەڵوێستت لەسەر ڕووداوەکان هەبێت. }جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کە لە ڕۆژێکی نمایشی ئەو شانۆییەدا خۆپیشاندانێک لە هۆڵی نمایشەوە سەرچاوەی گرت و درێژەی کێشا، بەڵام بۆ پارێزگاری لە گیانی ستافی کارەکە خەڵکەکە ڕێڕەوەکەیان بە زوویی گۆڕی و سەرچاوە سەرەکییەکەیان وێڵ کرد}.

کەواتە چێوار گەلێک وریایە لە هەڵبژاردنی نەسیندا و دواتر ئەو هەنگاوەش لە تیپی پێشڕەودا درێژەی دەبێت و یەکێکی دی لە بەرهەمەکانی نەسین (دڕندەی تۆڕۆس) نمایش دەکەن و پەیامی نوێ لە ڕێی ئەو نمایشەشەوە ئاڕاستەی ڕۆژگارەکە و دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەو سەردەمە دەکەن.

**هێنانەگۆی گوتاری جیاواز**

ئیدی ڕێڕەوی ئەو کاروانە تەنها لەو گۆشانەدا ناوەستێ، کە نزیکی خۆین، بەڵکو بەرەو دنیای ئەوانی تریش پەل دەهاوێ و گەشتی خۆی دەکات. ئەو ناوەستێ و بڕوانێ، بەدەم ڕێوە بۆ فاکتەرەکانی دەگەڕێت و دەیەوێت تەواوی تواناکانی لە ڕاژەی ئەو گوتارەدا بن، کە لە سەرەتاوە بە مەبەستی جیاوازبوون دەستی پێکرد.

چێوار بە کارکردنی لە دەقی میللەتانی تردا بەردەوام بۆ وێنەی چەوسانەوە دەگەڕێ و دەیەوێت وەرگر بخاتە بەردەم دۆخی بەراورد و پرسیار. هەڵبەتە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا سانسۆر بە لایەک و هاوشێوەبوونیش بە لایەک دەرهێنەرانی کوردیان بەرەو زۆر گۆشەی دنیا بردووە، ئیدی لە ئێرلاندای زامدار بە دەستی بریتانیاوە بۆ فەلەستین و ئەفریکا و ئەمریکای لاتیین. ئەوەتا چێوار لە (مێژی بەرخۆر)ی (لانگستن هیوز 1902- 1967 Langston Hughes)دا جۆرێکی تر لە چەوسانەوە بەرجەستە دەکات، دۆخی ئەو ڕەشپێستانە نمایش دەکات، کە سیاسەتی ئاپارتاید و دیدی ڕەیسیزم ناتوانێ قبوڵیان بکات و دەیەوێت فڕێیان بداتە ئەودیو دنیابینیی خۆیەوە. هیوز لە ئەمریکای ئەو ڕۆژگارەدا وەک ڕەشپێستێک داکۆکی لە مافی ژیان دەکات. ئەو کاتەی مرۆڤەکان لەسەر جیاوازییان لە ڕەگەز و جۆردا قبوڵ ناکرێن و کەرەستەن بۆ چەوسانەوە، بەڵام خۆڕاگرییان لە بەردەم هەموو ئەو دژایەتیکردنەدا ئاکام سەرکەوتوویان دەکات. چێوار ئەو دۆخە بە دۆخی کوردبوون لە عێراقی ئەو سەردەمە بەراورد دەکات، بەتایبەت لەو دۆخەی سەردەمی ئەنفال. ئەو سەردەمەی تەنها کوردبوون بەس بوو بۆ ئەوەی ببێتە کەرەستەی چەوساندنەوە و لەناو ببرێت. هەڵبەتە ئەو دۆخە خۆی دنیایەک پرسیار لەگەڵ خۆی دێنێت، وەلێ ئەوەی چێوار دەیکات، جارێکی دی بەئاگاهێنانەوەی وەرگرە لەوەی لە چواردەوری دەگوزەرێت. ئەو وەک دەرهێنەرێک کە کار بۆ وەرگرەکەی دەکات، ڕەفتار دەکات و بەردەوام وەرگر دەخاتە بەردەم بەرپرسیارێتی. وەرگرێکی دەوێت هۆشیار بە زەینی خۆی و ئەو ژێوارەی تێیدایە، کەسێک بتوانێ ئاماژەکان لە نێو نمایشدا بخوێنێتەوە. بە دڵنیاییەوە ئەو وەرگری سادەشی فەرامۆش نەکردووە و لە ڕێی کۆمیدیاوە بە سانایی ڕازیی دەکات، وەک چۆن لەگەڵ وەرگرە تایبەتەکانیدا لەسەر ئەو پەیمانەی خۆی بەردەوامە، کە لە سەرەتاوە دەستی پێکردووە و تا دواساتی ژیانیشی دەستبەرداری نەبوو.

پایان

هەڵبەتە قسەکردن لەسەر ئەزموونی شانۆکارێکی پڕ بەرهەمی وەک چێوار بەبێ هەبوونی ئەرشیفێکی دەوڵەمەند بۆ پێداچوونەوە بەوەی

ڕووی داوە، گەلێک زەحمەتە، چونکە بۆ نووسینێک کە بیەوێت لایەنی کەمی دروستی و حەقیقەت لەخۆ بگرێت، ئەو پێداچوونەوەیە پێویستە و ناکرێت بە تەنها پشت بە یادەوەریی ببەستین. بەڵام ئەو ئەرشیفە لە کوێیە؟ کورد کەی دەتوانێ ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی ئەلیکترۆنی هەبێت، کە هەر توێژەرێک ویستی، لە کات و ساتی خۆیدا دەستی پێی بگات. هەڵبەت بۆ منی دوورەوڵات دەستگەیشتن بە ئەرشیفە تایبەتەکەی خۆشم گەلێک زەحمەت بوو. بۆیە ئەم نووسینە ناچێتە قاڵبی توێژینەوەیەکی ئەکادیمییەوە، چونکە بە تەنها پشت بە یادەوەری دەبەستێت. بە هیوام ڕۆژێک، کەسێک، دەزگایەک، دامەزراوەیەک لەو هەموو دامەزراوە زۆروزەوەندەی بە ناوی ڕوناکبیرییەوە کراونەتەوە، بیر لە پرۆژەی ئەو ئەرشیفە ئەلەکترۆنییە بکەنەوە تا بەرهەمی هەمووان بە چێواری پێشڕەویشەوە لەوێدا بەردەست بن و کۆمەکی نووسینەکانی ئاییندەمان بکەن.

شانۆگەری لالۆ ڤانیا

# هونەرمەندی گەورەی خێرنەدیوو (عوسمان چێوار)ی ڕەوانشاد

ئەنوەر قادر ڕەشید

کاتێک دەتەوێ دەربارەی شانۆکارێکی کورد بنووسی و هەوڵ دەدەیت هەمەلایەنە باسی لێوە بکەیت، ناچار دەبیت بۆ ئەوەی باس لە دید و لایەنی مەعریفی و ئیستاتیکی و تەکنیکیی کارکردنی لە بەرهەمەکانیدا بکەیت، پەنا بەریت بۆ زەین و یادەوەرییەکانی خۆت لەگەڵ ئەو هونەرمەندە و ئەو لایەنەش ئەوەندەی بە لای کارەکتەری خۆیدا دەتبا، ناتوانیت بە هەمان قەبارە باس لە بەرهەمەکانی بکەیت، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ هەژاریی ئەرشیفکردنی زانستییانەی

مێژووی بزووتنەوەی شانۆییمان.
ڕەنگە هەندێک جار بە تۆمارکردنی ڤیدیۆیی بەرهەمێک بتوانین بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەگەر ڕووکەشیش بێ، دەربارەی بنووسین و شرۆڤەی لەسەر بکەین، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەوەی بەشێک لە لایەنی تەکنیکی و داهێنانی بەرهەمەکە ئەبێتە قوربانیی چاوی کامێرا و قرتاندنی لە مۆنتاژدا.
ئەگەر ئێمەش وەک هەموو دنیا هونەرمەندان و بەرهەمی هونەرمەندانمان ئەرشیف بکردایە، ئەوە بە دڵنیاییەوە نەمریی هونەریمان بۆ خودی هونەرمەندەکە تۆمار ئەکرد و ئەبوونە مەتریالێکی ئامادەش بۆ هەر توێژینەوەیەکی زانستی بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی میتۆد و ڕێبازی کارکردن و پێشخستنی، چونکە هەروا ئاسان نییە دەربارەی شانۆکارێکی کارا و داهێنەر بنووسیت، کە نە ڕیپۆرتاژێکی هونەریی لەگەڵدا کرابێ و نە خۆی دیدی هونەریی نووسیبێتەوە و نە سکریپتی بەرهەمە هونەرییەکانیمان لەبەردەستدا بێت، خۆ ئەگەر پەنا بۆ یادەوەریی و زەینی خۆت بەری، ئەوە لایەنی کەسایەتی بەسەر لایەنی هونەریدا زاڵ ئەبێت و بابەتەکە زیاتر ئەبێتە هەست و سۆز بۆ ئەو هونەرمەندە و لایەنە شاراوەکانی داهێنانی ئەگەر فەرامۆشیش نەکرێ، ئەوە بە دڵنیاییەوە کاڵ ئەبێتەوە، چجای کەسایەتییەکی هونەرمەندی گەورەی وەک مامۆستا عوسمان
چێواری مامۆستا و نووسەر و وەرگێڕ و ئەکتەر و دەرهێنەر.
چێواری مامۆستا و مرۆڤدۆست و مەشرەفخۆش و پێشمەرگە و تێکۆشەر و ڕۆشنبیر بووە ئەزموون و بنەمای دروستبوونی چێواری چالاک و داهێنەر لە بواری ئەدەبی و هونەریدا.
چێواری ڕەوانشاد وەک ئەکتەرێکی سەرکەوتوو لە شانۆگەریی (بڕیار و ئەنجام ٦٩، سەرینی باداری ٦٩، پێنج کەس لە ئوتێلێکدا ٧٠، ئوتومبێلچی ٧٠، چاوی کوردستان

٧٤، پردی وڵات ٧٤، ڕەجەب و پیاوخۆران ٧٥، ئابڵوقە ٧٦، خەج و سیامەند ٧٨، لالۆ ڤانیا ٨٠، گوڵەمێخەک ٨٠، دوکتۆر پاڵمی ٨٢ ...) بەشداریی کردووە و لە بواری نووسین و ئامادەکردندا ئۆپەرێتی (پێنووسی ڕووناکی) و شانۆنامەی (ئەحەی کوڕنو)ی بەرهەم هێناوە و (ئابڵوقە و لالۆ ڤانیا و مەلی دەریا)ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
بە وردبوونەوەیەک لەو بەرهەمە شانۆییانەی وەک ئەکتەر بەشداری تیا کردوون، بە ڕوونی ئەبینین کە لەو لیشاوی شانۆییانەی نمایش کراون، بەشداریی لەو تێکستانەدا کردووە، کە لە ڕیزی بەرهەمە هونەری و ئاستبەرزەکاندا بوون و لەگەڵ هەر ئەزموونێکدا زیاتر قاڵ بووە و زیرەکانە خۆی پەروەردە کردووە و بەردەوام بەرەو پێش چووە و هەر ئەوەش بووە مایەی ئەوەی بە یەکێ لە ئەکتەرە هەرە بەتواناکانی

شانۆ بناسرێ و بتوانێ بەوپەڕی لێهاتووییەوە بەرجەستەی ئەو کارەکتەرانە بکات، کە نمایشی کردوون و وەک وەرگێڕیش جوانترین دەقە عێراقی و بیانییەکان وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی.
مامۆستا عوسمان چێوار لە کاروانی هونەریی خۆیدا لە نمایشەکانی چالاکیی قوتابخانەکان و تیپی نواندن و مۆسیقای سلێمانی و کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی و تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی کاری کردووە و ئەستێرەی درەوشاوەی هەریەکە لەو گروپ و تیپ و کۆمەڵانە بووە، کە کاری لەگەڵ کردوون.
وێناکردنی عوسمان چێواری هونەرمەند وەک نووسەر و ئەکتەر و وەرگێڕ بێ ئەوەی باس لە دیزاینی دیکۆر و دەرهێنانی زیاتر لە پانزە بەرهەمی شانۆیی بکەین، ئەبێتە کەمکردنەوەی توانای ئەو کەڵە هونەرمەندە و تەماویکردنی دیدی هونەری و ڕادەی تێگەیشتنی لە هونەر و زانستی شانۆ، بۆیە بەسەرکردنەوەی ئەو بەرهەمانە ئەبنە تەواوکەری کاراکتەری هونەری چێواری ڕەوانشاد.
هەندێک لەو بەرهەمانەی کاری دەرهێنانی بۆ کردوون (داسەکەی شاسوار ٧٣، چاوی کوردستان ٧٤، گورگی بێشە و هەرد ٧٩، زەلکاو ٨١، ڕاستییەکە مرد ٨٣، مرۆڤ و شارەکەی ٨٣، دڕندەی تۆرۆس ٨٧، مۆزارت و سالیری ٩٠، گوڵەمێخەک ١٩٩٢، گوڵ عومەر ١٩٩٣، بەهەشتێکی سووتاو ١٩٩٤، مرۆڤ و شارەکەی ١٩٩٥ و ئەحەی کرنو ١٩٩٥).
لەم پانۆراما جوانەی بەرهەمەکانی چێواردا بە ڕوونی ئەبینین کە چەند شارەزایی لە شانۆی جیهانی و کولتووری نەتەوەکەیدا هەبووە، چۆن توانیوویەتی شاکارە جیهانییەکان بە شێوازێکی هونەری و ڕیتمێکی تایبەتەوە بکاتە نمایشێکی پڕ چێژ و بە شیکردنەوەی دەلالاتە مەعریفی و ئیستاتیکییە وابەستە و نزیک لە خەسڵەتە مرۆڤایەتییەکانەوە، بینەر بە کورسیی هۆڵەوە ببەستێتەوە و هزر و هەستی بۆ نمایش ڕاکێشێ.
ئەوەی زۆر سەرنجڕاکێشە لە بەرهەمەکانی چێواردا، نمایشی شانۆی میللییە، ئەو شانۆیەی بە جوانترین شێوازی ئەکادیمی بابەتێکی میللی ئەخاتە سەر تەختەی شانۆ و بە وردترین و سادەترین ماتریالی میللییەوە نمایشێکی تۆکمەی ئەکادیمی بە ڕیتمێکی نزیک لە پێکهاتەی کولتووری نەتەوەییەوە بەرهەم ئەهێنێ، ڕەنگە دەستەواژەی (شانۆی میللی) لای هەندێک کەس بە شانۆیەکی ڕووکەشی ناهونەری لە قەڵەم بدرێ و بخرێتە پاڵ ئەو بەرهەمە کاڵوکرچانەی بە ناهەق ناوی شانۆی میللییان پێوە لکێنراوە، بەڵام لە ڕاستیدا شانۆی میللی بەبەهاترین و بەپێزترین بەرهەمی ئەکادیمیی نزیک لە خواست و هەست و نەستی وەرگرە و بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییەش ئەوەیە زۆربەی زۆری بەرهەمەکانی هەردوو کەڵە هونەرمەندی کۆچکردووی عێراقی (عەونی کەرومی و قاسم محەمەد) ئەچنە خانەی شانۆی میللییەوە و نمایشەکانیش لە زەینی بینەردا هەڵکەنراون و بە نەمری ماونەتەوە. هەر بەو پێوەرەش ڕەجەب و پیاوخۆران و چەخماخە و خەج و سیامەند و لانەوازان و .....تاد، بوونەتە نموونەی شانۆی میللی.
ئەگەر بە دیقەتەوە بڕوانینە نمایشی (ئەحەی کرنو) لە ئامادەکردن و دەرهێنانی عوسمان چێواری ڕەوانشاد، بە نیازی ڕوونکردنەوەی لایەنە درەوشاوەکەی دیدی ئەو کەڵە هونەرمەندە و ڕوون و ڕەوانیی فیکری لە بەرهەمهێنانی نمایشێکی ناوازەی پڕ چێژدا، ئەبینین لە بەرگێکی میللیدا، جوانترین بابەتی مێژوویی بە ئیمڕۆوە گرێ داوە و لە ڕێی قۆشمەچییەکی وەک کرنوەوە، بەرخودان و بەرەنگاربوونەوەیەکی مێژوویمان ئەبەستێتەوە بە قۆناغێکی سەردەمەوە، کە شاکارە جیهانییەکان دەیگەڕێننەوە بۆ ناخی خودی مرۆڤ و لە ناساندنی خودەوە بۆ بنیادنانەوەی کۆمەڵگەیەکی تەندروستی بیگرێ. چێوار لەو بەرهەمەدا زۆر بە ڕوونی دیدی خۆی بۆ شانۆ ئەخاتە قاڵبی دەربڕینێکی تەواو زانستی و هونەری

و تێگەیشتنی لەو هونەرە هەمەلایەنە، بە وێناکردنی کاراکتەر و گرێ و پەیوەندیی کاراکتەر و لایەنی مەعریفی و ئیستاتیکی لە بەرهەمێکی نزیک لە خواستی وەرگر و بە ڕیتمێکی میللی وابەستەی کۆمەڵگەی کودەوارییەوە.
دەقی ئەحەی کرنو دەچێتە خانەی تێکستی ڕیالیزمیەوە بەپێی ئەو پێناسەیەی ڕیالیزم کە مەرج نییە ڕووی دابێ، بەڵکو ئەگەر مەرج و دەرفەتی خۆی لە قۆناغێکدا بۆ بڕەخسایە ڕووی ئەدا. بۆیە لەو ڕوانگەیەوە ئەتوانین توانای دەربڕینی چێواری داهێنەر بخەینە چوارچێوەی نووسینی سیناریۆ بۆ سەر شانۆ، هەر لەو بەرهەمەدا بە ڕوونی ئەبینین کە لە کاتی ئامادەکردنی دەقەکە دیدی خۆی بۆ شێوازی دەرهێنانیش ڕەچاو کردووە و هەموو لایەنەکانی جوانناسی و مەعریفی و پەیوەندییە شاراوەکانی شی کردووەتەوە و توانیوویەتی بە کەڵکوەرگرتن لە وردەکارییەکانی شانۆی جیهانی، کاراکتەری تۆکمەی هەمەلایەنە بە زمانێکی ئاسان بە شێوازێک بە بینەر بناسێنێ، کە لە سێبەری بیرەوەرییەکانی و حەشارگەی هەقایەتەکانی داپیرەدا بە شێوەیەک لە شێوەکان وێنا کراوە و چێواریش بە خوێندنەوەیەکی سەردەمییانە دووبارە سیاغەی ئەکاتەوە و لە بەرگێکی نوێدا ئەیخاتەوە سەر شانۆ و بە زیندوویی ئەیهێڵێتەوە.
لەسەر چێواری مرۆڤ و چێواری هونەرمەند زۆر هەیە بوترێ و کەم سەرچاوە لەبەر دەستدان و ڕەنگە ئەم بوارە ڕەخساوەی ئێستا هاندەرێک بێت بۆ هونەرمەندانی تر کە بەرهەمەکانیان بە دید و بۆچوونی خۆیان و تێگەیشتنیان لە هونەر و زانستی شانۆ ئەرشیف بکەن و بیکەنە سەرچاوە بۆ توێژینەوە و بەدواداچوونی بەرهەمی ئەو داهێنەرانەی وەک سەربازی ون چالاکییەکانیان لەگەڵ خۆیان ئەبەن و تەنیا ناو و یادگارییەکان ئەمێننەوە. ئەو یادەوەرییانەی لە چوارچێوەی سۆز تێپەڕ ناکەن و نابنە ماتریالی لێکۆڵینەوەی زانستی و هونەری.
ئێمە ئەزانین هونەرمەندێکی گەورەی وەک عوسمان چێوار زۆر لەوە زیاترە، کە بتوانین بە چەند دێڕێک بەرهەمەکانی بەسەر بکەینەوە، بۆیە ئومێد ئەکەم ئەگەر سکرێپتی بەرهەمەکانی لای تیپ و گروپە هونەرییەکان ماون، با بخرێنە بەر دەست و کەڵکیان لێ وەربگیرێ.
سڵاو بۆ گیانی پاکی کەڵە هونەرمەندی کورد (عوسمان چێوار)، کە بە کۆچی ناوادەی زیانێکی گەورەی لە شانۆی کوردی دا و کۆڵەکەیەکی پتەوی تیپی پێشڕەویش داڕما.

ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار تایبەت دەبێت بە هونەرمەند

# کەریم کابان

# عوسمان چێوار

# پیاوێک لێوانلێو لە خەون

## ئازاد بەرزنجی

کات: زستانی ساڵی 1980 بوو. شوێن: هۆڵی قوتابخانەی خالیدییە، کە دواتر کرا بە هۆڵی چالاکیی قوتابخانەکان. ئەو دەمە من لە سەرەتای لاویدا بووم و ڕۆڵی ((مارسان))م پێدرابوو لە شانۆنامەی ((دکتۆر پاڵمی))دا، کە لە نووسینی نووسەری ئیسپانی ئەنتۆنیۆ بۆیرۆ باییخۆ بوو و شاعیری کۆچکردوو شێرکۆ بێکەس کردبووی بە کوردی و هونەرمەندی کۆچکردووش جیهاد دڵپاک دەرهێنەری بوو. کۆمەڵێک هونەرمەندی بەتوانا لەم شانۆنامەیەدا دەوریان دەبینی، لەوانە: هونەرمەند عوسمان چێوار، فازڵ قەساب،

ئازاد جەلال، عەلی کەریم، عومەر دڵپاک، عەلی نوری و شەماڵ عومەر و هتد.. دەمەوێ بڵێم لە ڕێی ئەم کارەوە بوو، کە بۆ یەکەم جار بە هونەرمەندی بەهرەمەند و لێهاتوو عوسمان چێوار ئاشنا بووم. هەڵبەت مەبەستم لەوەیە کە لە نزیکەوە ناسیم، دەنا پێشتر لە هەندێ کاری شانۆییدا بینیبووم و وەکو ئەکتەرێکی کارامە و دەرهێنەرێکی بەتوانا لە دوورەوە دەمناسی.

یەکەم ڕۆژی پرۆڤەی پراکتیکیمان بوو، وەختێ خۆم کرد بە هۆڵەکەدا؛ تەماشام کرد عوسمان چێوار لە پەنا زۆپایەکەوە هەڵتروشکاوە و جگەرەکەشی بە دەستییەوەیە. پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێم کە بە درێژایی ڕۆژانی پرۆڤەمان ئەمە حاڵی بوو؛ لای زۆپاکەوە دادەنیشت و جگەرەی دەکێشا. ئەو ڕۆژە هێشتا پرۆڤە دەستی پێنەکردبوو. چوومە لایەوە و پاش سڵاو و چاکوچۆنی کەوتینە گفتوگۆ لەسەر شانۆنامەکە و هەروەها ئەویش هەندێ سەرنجی سەبارەت بەو کاراکتەرە دا بە من، کە ڕۆڵەکەیم دەبینی. ئەمە سەرەتای زنجیرەیەک وتووێژ و هەروەها پەیوەندییەکی هونەری بوو، کە تا دواکۆچی درێژەی خایاند.

چێوار لە شانۆنامەی ((دکتۆر پاڵمی))دا ڕۆڵی دکتۆرەکەی دەبینی. لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بەوە بدەم، کە چێوار هەم لە نواندندا و هەم لە دەرهێناندا قوتابییەکی زیرەکی ڕێبازەکەی کۆنستانتین ستانسلاڤسکی بوو، کە دەتوانین بە ڕیالیزمی سایکۆلۆجی ناوزەدی بکەین. چێوار بە وردی لە ڕەهەندەکانی ئەو کاراکتەرەی دەکۆڵییەوە، کە ڕۆڵەکەی دەبینی. ئەو باوەڕی وابوو کە تا چەند بە وردی ئەو کارەکتەرە شی بکەینەوە، کە دەمانەوێ لەسەر تەختەی شانۆ بەرجەستەی بکەین؛ زیاتر بە کونج و کەلەبەرەکانی ئاشنا دەبین و پتر هەقی خۆی دەدەینێ و بە شێوەیەکی هونەرییانەتریش دەتوانین ڕۆح بکەین بەبەریدا و بەرجەستەی بکەین. هەر بۆیە چێوار ئەکتەرێک بوو بە عەشقەوە مامەڵەی لەگەڵ کارەکەیدا دەکرد و بە وردی هەڵوەستەی لەسەر دایەلۆگەکان و جووڵەکانی دەکرد و لای ئەو بەهای دایەلۆگەکان هیچی کەمتر نەبوو لە بەهای جووڵە لەسەر شانۆ، پێویستە لێرەشدا ئەوە بڵێم کە نواندنی بۆ کارەکتەری دکتۆر پاڵمی نواندنێکی کاریگەر و سەرکەوتوو بوو، نمایشەکەش بە یەکێک لە نمایشە سەرکەوتووەکانی ئەو ساڵانە لە قەڵەم درا.

عوسمان چێواری دەرهێنەر:

بەر لەوەی باس لە شێوازی دەرهێنان لای هونەرمەند عوسمان چێوار بکەم، دەمەوێ ئەوە بڵێم کە ئەو خوێنەرێکی باشی ئەدەب و بەتایبەتیش دەقی شانۆیی بوو. بەڵام لە نێو نووسەرە شانۆییەکاندا؛ بەتایبەتی عاشقی شانۆنووس و چیرۆکنووسی ڕووسی ئەنتۆن چیخۆڤ بوو. هەر ئەمەش وای کرد چەند دەقێک لە دەقە ناوازەکانی ئەو نووسەرە مەزنە بۆ شانۆ دەربهێنێت، لەوانە: لالۆ ڤانیا و باخی گێلاس و مەلی دەریا.

پێشتر وتمان کە چێوار سەر بە

قوتابخانەکەی ستانسلاڤسکی بوو لە نواندن و دەرهێناندا، بەڵام دەبێ لە پاڵ ئەمەدا ئەوەش بڵێین، کە پەنابردنی چێوار بۆ ئەو ڕێبازە لەوەوە دەهات، کە ئەو خۆیشی هونەرمەندێک بوو لایەنگری (ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە) بوو لە شانۆدا. هەربۆیە ڕێبازەکەی ستانسلاڤسکی باشترین ڕێگا بوو بۆ گوزارشتکردن لەو دنیابینییەی. چێوار باوەڕی وابوو کە دەکرێ لە ڕێی ڕێبازەکەی ستانسلاڤسکییەوە هەموو بیروبۆچوونە ڕەخنەییەکان سەبارەت بە دەسەڵات و بە کۆمەڵگا و دیاردە نامرۆییەکان بخەینە ڕوو، بەڵام مەرج نییە بۆ ئەو ((خستنەڕوو))ە پەنا بۆ هاتوهاوار و ژاوەژاو بەرین. نەخێر، دەتوانین زۆر بە هێمنی و بە نەرمی ئەو بیرۆچوونانەمان لە ڕێی فۆرمە شانۆیی و هونەرییە بەرزەکانەوە دەربرین، هەروەکو ئەوەی لە دونیاکەی چیخۆڤدا دەیبینینەوە. لە شانۆنامەکانی چیخۆڤدا نە شەڕوشۆڕ و نە هاتوهاوار دەبینین، بەڵام لەو ئارامی و بێدەنگییەی شانۆی چیخۆڤدا توندترین و کاریگەرترین ڕەخنە بۆ دڵڕەقییەکانی سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بۆ ناعەدالەتییەکان دەخرێنە ڕوو. جگە لەمانە، ئەوەی لە شانۆی چیخۆڤدا زیاتر لە هەر شتێکی تر چێواری بە لای خۆیدا کەمەندکێش دەکرد؛ ئەو عەشقەیە کە لای کارەکتەرەکانی چیخۆڤ دەیبینین بۆ ژیان و بۆ ئینسان، بۆ ماڵئاوایی لە بەها تەقلیدییەکان و هەڵوەدابوون بۆ بەهای مرۆیی تازە و بۆ ژیانێک کە شایستە بێت بە کەرامەتی ئینسان؛ چونکە ئینسان بەهادارترین بوونەوەری سەرزەوییە و پێویستە هەموو شتەکانی تر لە خزمەتی ئەو و لە خزمەتی ژیاندا بن. لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا عوسمان چێوار یەکێک بوو لەو دەرهێنەرە کەمانەی کە شانۆیان هەم وەکو هونەرێکی باڵا و هەم

وەکو پەیامێکی ئینسانیی گەورە تەماشا دەکرد و تەواوی هەڵبژاردنەکانی بۆ ئەو تێکستە شانۆییانەی هەڵیدەبژاردن؛ لەم باوەڕەوە سەرچاوەیان دەگرت. شایانی باسە ئەو شانۆنامانەی چیخۆڤ کە بۆ شانۆ دەریدەهێنان؛ هەر خۆیشی بۆ کوردی وەری دەگێڕان، چونکە ئەو بۆ خۆی لەو بڕوایەدا بوو کە مۆسیقایەک و ڕیتمێک لەو دەقانەدا هەیە، کە هەر خۆی دەزانێ چۆن پەییان پێدەبات و چۆن بە کوردی دایان دەڕێژێتەوە. ئەو شانۆنامانەیش دواتر لە کتێبێکی سەربەخۆدا لە لایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمەوە چاپ کران.
چێوار ئەم کارانەی خۆی لە ڕێی تیپی شانۆی پێشڕەوەوە پێشکەش دەکرد. شتێکی ئاشکراشە ئەم تیپە هەر لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە و تا کۆتایی هەشتاکان کۆمەڵێک شانۆگەریی ناوازەی پێشکەش بە عاشقانی ئەم هونەرە کرد و لە مێژووی بزووتنەوەی شانۆیی کوردیدا پێگەیەکی دیاری هەیە؛ "خولە چەخماخە" و "لانەوازان" تا ئێستاش لە یادی بینەرانیدا بە زیندوویی ماونەتەوە.
لە ساڵی 1989دا چێوار شانۆنامەی ((مەلی دەریا))ی چیخۆڤی بۆ دەرهێنان هەڵبژارد. ئەو دەمە بارودۆخی سیاسی گەلێ سەخت و دژوار بوو. منی ڕاسپارد تا ڕۆڵی کاراکتەری ((تربلیۆڤ)) ببینم. گەرچی من لەبەر هەندێ بارودۆخی تایبەتی نەمتوانی بەشداری لەو کارەدا بکەم، بەڵام نمایشەکە بە سەرکەوتوویی پێشکەش کرا و یەکێک بوو لە کارە جوانەکانی ئەو کاتە.
دواکاری هونەری کە لەگەڵ ئەم هونەرمەندە ژیاندۆست و مرۆڤدۆستەدا کردم، کارێکی تەلەفزیۆنی بوو، کە دوای ڕاپەڕین و لە کۆتاییەکانی ساڵی 1991 دا هێنامانە بەرهەم. ئەویش ((گوڵەمێخەک)) بوو. هەڵبەت دەبێ ئەوە بڵێم کە چێوار لەم کارەدا سەلماندی کە جگە لەوەی ئەکتەر و دەرهێنەرێکی شانۆیی داهێنەر بوو؛ وێنەگر و دەرهێنەرێکی تەلەفزیۆنیی بەسەلیقەش بوو. جگە لەو دیمەنانەی کە خۆیشی دەوری تیایاندا هەبوو؛ تەواوی دیمەنەکانی تر هەر خۆی وێنەی دەگرتن.
هەڵبەت بە درێژایی ئەو ساڵانە و بە تایبەتیش ساڵانی دوای ڕاپەڕین و کارکردنمان پێکەوە و لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێی هونەرمەندی تردا و لە سەرەتای بەشداریکردنمانەوە لە دامەزراندنی یەکەمین تەلەفزیۆنی کوردیدا دوای ئازادکردنی کوردستان، چەندین یادگار و بەسەرهات و بیرەوەریی ترمان لەگەڵ چێواری ڕەوانشاددا هەیە، کە گێڕانەوەیان لە سنووری دیاریکراوی ئەم نووسینە دەردەچێت و دەشێ لە دەرفەتێکی تردا باسیان لێبکەین.
دواجار دەمەوێ بڵێم، کەمن ئەو دیمەنانەی لە ناخەوە مرۆڤ دەهەژێنن و ڕۆحی زامدار دەکەن. بە لای منەوە یەکێک لەو دیمەنە دڵتەزێنانە؛ دیمەنی کۆبوونەوەی هاوڕێیان و هونەرمەندان بوو لە دەوری تەرمەکەی هونەرمەند عوسمان چێوار لە مزگەوتی سەیوان. باوەڕم نەدەکرد ئەو پیاوەی کە باوەڕی بە پیری نەبوو (چونکە هەروەکو یەکێک لە پاڵەوانەکانی چیخۆڤ دەڵێت؛ لە هەر کۆییەک هونەر هەبوو؛ پیری نییە)، ئەو پیاوەی کە پڕ بوو لە عەشق بۆ ژیان، ئێستا وەکو کۆترێکی باڵشکاو لە ترۆپکی ئاسمانی هونەرەوە کەوتووەتە خوارێ و مەرگ لە ئامێزی گرتووە. بەڵام نا، ئەو نەمرد؛ چونکە داهێنان نامرێت، سوهراب گوتەنیش: مەرگ کۆتایی کۆتر نییە.

دەزگای
چاپ و
پەخشی
سەردەم

# ٣
# شانۆنامەی چیخۆڤ

- مەلی دەریا
- باخی گێلاس
- لالۆ ڤانیا

وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە:
عوسمان چێوار

# عوسمان چێوار

## ماڵی هونەرەکەی، هەمیشە ئاوەدان بوو!

**سیروان جەمال (کەشکۆڵ)**

بۆ یادی چێوار، بۆ یادی هونەرمەندێکی مرۆڤدۆست و بیر ڕووناک، هونەرمەندێکی خەمهەڵگری گەل و نیشتمان... بۆ یادی ئەم پیاوە مەزنە. نە وشە، نە زمان، نە قەڵەم توانای ئەوەی نییە وەسفی هونەر و ئەندێشە و شاکاری ئەو بکات. لە هەڵوێستدا، هەڵوێست بەرامبەر دیاردە دزێوەکان، هەمیشە سەرقافڵەی هەمووومان بوو. لە هونەردا، ڕاستگۆ، لە داهێناندا جدی و شێلگیر بوو. ئەم پیاوە، وێڕای ئەوەی موڵکی میللەتەکەی بوو، سەرەڕای ئەوەش، مامۆستا و هاوڕێ و هاوسەفەری هونەریی منیش بوو.
سەیرە، من هەست ناکەم ئەم پیاوە کۆچی کردووە و هەمیشە هەست دەکەم لەگەڵمدایە، لەگەڵ هونەرەکەم، لەگەڵ ڕۆحمدایە... ئاخر چۆن وا نەبێت، منێک لە ساڵی (1976)ەوە بوومە ئەندامی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی، هەر لەو چرکەساتەوە، چێوار بووە مامۆستای هونەرەکەم و بووە سەرمەشقی جوامێری و بەهاکانی نیشتمانپەروەری و مرۆڤدۆستی، نەک تەنها بۆ من، بەڵکو بۆ هاوڕێکانی تریشم.

چێوار هەمیشە بایەخی بە هونەرەکەی من ئەدا. هەمیشە ڕێنمایی ئەکردم و هانی ئەدام.. ئاخر ئەو بووە ئەو ڕێنیشاندەرە مەزنەی لەگەڵ هەموو هەنگاوە هونەرییەکانی مندا هەر لە نواندن و دیزاین و دیکۆرەوە بیگرە هەتا سەرجەم کارە هونەرییەکانی تریش، پشتگیریی تەواوی ئەکردم. هەموو جارێ کە تیپی پێشڕەو پلانی هەبووایە بۆ ئامادەکردنی بەرهەمێکی نوێ، لە دەستپێکی پلانەکەدا چێوار بانگی دەکردم. پاکەتە جگەرەکەی کە بەتاڵ دەبوو، ئەیدڕاند و دەستمان دەکرد بە هێڵکاریی دیکۆری شانۆییەکە...
ئێستاش دەنگی لە گوێمدایە کە دەیوت: خاڵە سیروان دەقەکە بە باشی بخوێنەرەوە و بەرگێکی جوانیشی بۆ بکە!
ئیتر منیش، شەوم ئەنا بەدەم ڕۆژەوە و دیکۆر و دیزاین و بەرگ و هەر کارێکی تری هونەریم پێبکرایە، درێغیم نەدەکرد. هەم لەبەر سەرکەوتنی کارەکە و هەم لەبەر ئەوەش کە چێوار ڕازی بێت... ڕەزامەندی ئەو، نیشانەی سەرکەوتنی من بوو!
چێوار نەک هەر لە هونەری شانۆدا، بەڵکو لە پیشەکەشمدا، پیشەی دارتاشی، مامۆستام بوو... پیشەکە لەوەوە فێر بووم. کە پێکەوە کارمان دەکرد، بەدەم دارتاشینی تەختە و داکوتانی بزمارەوە، باس هەر باسی شانۆ و تیپ بوو.
ئاواتی گەورەی چێوار دروستکردنی شانۆیەک بوو بۆ تیپی پێشڕەو.. ئیتر ئەوە بوو پێکەوە لەگەڵ هەموو هاوڕێیانی تیپدا، بە چنگ و کۆمپرێسەر (شانۆ خنجیلانەکەی پێشڕەو)مان لە گەڕەکی (تووی مەلیک)ی سلێمانی دروست کرد.
قۆناغێکی تری زێڕینی ژیانی من لەگەڵ ئەم پیاوە جوامێرەدا بەشداریکردنم بوو لە دانانی بەردی بناغەی یەکەم تەلەفزیۆنی کوردی (تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان). یادەوەرییەکانم لەگەڵ چێواردا زۆر و زەوەندن. یەکێک لەوانە لە شانۆی (ئەحەی کڕنوو)دا هەموو ئەکتەرەکان جلەکانیان لە یەک بوون (موحد بوو). یەکەم ڕۆژی پێشکەشکردنی شانۆییەکە جلەکانیان تەواو بووبوو، پرۆڤەمان پێوە نەکردبوو، کە لە بەرمان کرد، هەمووی لەگەڵ یەک گۆڕابوو، بۆ نموونە کاک مستەفا جلەکانی منی لەبەر کردبوو، زۆر کورت بوو لە بەریدا. منیش ئەوەی ئەو زۆر درێژ بوو. ئیتر بەو شێوەیە زۆربەی برادەران ئاوا گۆڕابوو، ئەمە وای کرد لە کاتی پێشکەشکردنی شانۆییەکەدا هەموو پێکەنیمان بە یەکتر دەهات. وەزعەکە ئەوە نەبوو خۆمان پێبگیرێت... پاش تەواوبوونی شانۆییەکە زۆر خەممان بوو چێوار لێمان زویر بێت و پێی ناخۆش بێت، بەڵام کە تەواو بوو، هەموومانی ماچ کرد و زۆر دڵی خۆش بوو، بە پێکەنینەوە وتی دەستتان خۆشبێ، نواندن لەم شێوازی شانۆییەدا یارییە. ئەمەشی تێئەکەوێ، ئێمەش زۆرمان پێ خۆش بوو.
ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی کرد، بەیانییەکەی وتی خاڵە سیروان برادەرێک لە سوید هاتووەتەوە و سەیری شانۆیی (ئەحەی کڕنوو) دەکەین لە ژوورەکەی کەشکۆڵ. بەتەمایە بیباتەوە بۆ سوێد لەوێ پێشکەشی دەکات، بەڵکو دوو پووڵ بۆ برادەران و تیپ پەیدا بکات.
لە ژوورەکە هاتە دەرەوە و دەستی خستە سەر سنگی و بە چیچکانەوە دانیشت. وتی سنگم زۆر ئەیەشێ، یەکسەر لەگەڵ کاک خەباتدا بردمان بۆ خەستەخانە. لە ژووری (إنعاش) قسەمان دەکرد. وتی خاڵە سیروان، من باشم، حەز دەکەم بڕۆیت. تەسویری کەشکۆڵ تەواو بکە، کۆتایی هەفتەیە و خەڵکی چاوەڕوانی کەشکۆڵ دەکات. بچۆرەوە بۆ (TV) با کەشکۆڵ دوا نەکەوێت.. ئەوە دواوتەی چێوار بوو؛ بەسەر شانمەوە لەسەر قەرەوێڵەکەی، ئەو هونەرمەندە مەزنە ماڵئاوایی کرد...
هەتا لە ژیاندا بم لە یادم ناچیت مامۆستا چێوار

چێوار
ڕۆژگار

# چێوار لە نەخشی بیرەوەرییەکانمدا

## یاسین قادر بەرزنجی

جارێکیان هاوڕێیەک وتی (هونەرمەندانی سەردەمی ڕەش و سپی لە یادەوەریی هەمووماندا بە زیندوویی ماونەتەوە). هەڵبەت مەبەستی لە تەلەفیزیۆنی ڕەش و سپیی سەرەتای هەفتایەکانی سەدەی ڕابردوو بوو، بە دیاریکراویش باسەکەی لەسەر بەشدارانی چیرۆکە تەلەفیزیۆنییەکانی دوای ڕێکەوتننامەی ئاداری 1970 بوو، کە لە بەغدا تۆمار دەکران و لە ماوەی بەشە کوردییەکەی کەناڵی کەرکوکەوە پەخش دەکران.

ئەو ساڵانە، یان لەو سەرەتایەدا، یەک لە تیپەکانی کاری دراما و زنجیرە بەرهەمهێنەکان (تیپی هاوڕێیانی گەزیزە) بوو، بە ڕێبەرایەتیی مامۆستای گەورەی هونەری کوردی (عومەری عەلی ئەمین). لەو سەرەتایەدا چیرۆکەکانی ئەو ژمارە هاوڕێیە لەگەڵ چەند بەرهەمێکی دیکەی تیپی نواندنی سلێمانی و بەشی نواندنی کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی (مەڵبەندی گشتیی)و تیپی کارگەی جگەرەی

کازیوەی دەم بەیانی هونەری کوردی بوو، دواتریش بووە یەکێک لە دەرهێنەرە گەورەکانی شانۆی کوردی، کە ئەویش هونەرمەندی ڕەوانشاد (عوسمان چێوار) بووە.
چێوار لە یەک کاتدا چەند بەهرەیەک بوو، ئەکتەر، دەرهێنەر، سەرکردەی گروپی هونەری و کەسێکی سەنگین لە کۆمەڵگای کوردەواریدا و مرۆڤێکی سەر بە بیری پێشکەوتنخواز و کوڕی ڕۆژی تەنگانە و قارەمانێکی نێو سەنگەری بەرگری و ڕێبواری ڕێی کوردایەتی و ئازادیخوازێکی کەموێنە و مامۆستا و سەرپەرشتیارێکی هونەریی خەمخۆر تا سەر ئێسقان.

**یەکەم جار... ناسینی چێوار**
وێڕای ئەوەی ڕەچەڵەک و (بەرزنجە) و شێخایەتی، باوکی هەردووکمانی پێکەوە گرێ دەدا، نزیکیی گەڕەک و کۆڵانیشمان لەیەکەوە وای کردبوو ناوبەناو مامۆستا چێوار ببینم. هەڵبەت بەندە دەساڵێک لەو بچووکتر بووم، بەڵام دیتنی شانۆگەریی (بڕیار و ئەنجام)ی ئەمینی میرزا کەریم لە کۆتایی شەستەکاندا لەسەر شانۆی سانەویی سلێمانی (بەر لە دامەزراندنی هاوڕێیانی گەزیزە)، وای کردبوو کە زوو زوو هەست و سۆزم پابەندی ئەو و هاوڕێکانی بێت، کە ئەو کاتە ئەوان خوێنکاری پەیمانگەی مامۆستایان بوون و بەرهەمەکەش بە ناوی بەشی نواندنی ئەو پەیمانگەیەوە بوو، ئەو کاتە منی بینەری سەرسام و هەڵوەدای شانۆگەرییەکانی سەر تەختەی سانەویی سلێمانی لە سەرەتای قۆناغی ناوەندیدا بووم. دواى بینینی (بڕیار و ئەنجام) و چەند بەرهەمێکی کۆمەڵی هونەر و وێژە (کە زۆربەیان لە دەرهێنانی مامۆستای گەورە ئەحمەد سالار بوون) هەر لەو

بڕیار و ئەنجام/ ١٩٦٩

سلێمانی) ڕەنگ و ڕووی بەدیمەنی سەرەتایەکی سەنگین بوون بۆ دەرکەوتنی نواندنی تەلەفیزیۆنی و ئەو ژانرەی هونەری دراما، کە پاشتر لە لای بینەری هونەری کوردی بووە هونەرێکی دڵخواز و خۆشەویست.
هاوکات دەبێ لە بەسەرکردنەوەیەکی وەهادا بەرهەمەکانی هونەرمەندانی هەولێر و کەرکوک لە یاد نەکەین، کە بوونە بەشێکی گرنگی ئەو ڕەنگ و ڕووەی نێو تەلەفیزیۆنی ڕەش و سپی.
یەکێک لە کارەکتەرە سەرەکییەکانی هاوڕێیانی گەزیزە ئەکتەرێکی دیار و مامۆستایەکی ئاشنا و هونەرمەندێکی ڕووناکبیر بوو، کە هەر لە سەرەتاوە ئەستێرەیەکی بەورشە و دەنگێکی سازگار و

سەروبەندانەدا، دوای بینینی بەرهەمەکانی تیپی گەزیزە، بەتایبەت (چەم بێ چەقەڵ نابێ)، کە چێوار یەک لە ئەکتەرەکانی بوو، هەرچەندە لە کۆڵانەکانی گەڕەکی گۆیژە و شەقامی سابونکەران و نزیک بەردەرکی سەرا، چێواری باڵابەرز و بەدیمەنم دەدی، کە هەمیشە قژە لوولەکەی جوان جوان دادەهێنا و زۆربەی جاریش قاتێکی ڕەشی دەپۆشی، تا لە چاوانم ئاوا دەبوو، سەرنجیم دەدا و زۆرجاریش (گەر تەنیا بووایە) بە سڵاوێکی گەرم و (خزمانەوە) لێی نزیک دەکەوتمەوە.

**چێواری تیپی پێشڕەو**

دوای دامەزراندنی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی لە ساڵی 1973دا، شانۆ و درامای کوردیی ڕوو لە قۆناغێکی دیکە بوو، قۆناغێکی گەشەسەندووتر، چێوار و هاوڕێکانی پێشڕەو دەستەبژێری هونەرمەندە بەهرەمەند و ڕووناکبیر و کوردپەرەوەرەکان بوون، بەشێکیان سەر بە ئایدیای چەپی پێشکەوتنخواز بوون و دنیابینیی ئەوان لەو ساڵانەدا جودا بوو لە بەشێک لە هونەرمەند و ئەدیبانی کورد. لەو ساڵەدا (چەخماخە)ی پێشڕەو دەنگی دایەوە، کە (لانەوازان)ی چێوار و هاوڕازەکانیشی چەند جارێ نمایش کرا، ئەوەندەی تر (پێشڕەوییەکان) لای بینەران لە دڵدا شیرین بوون و مامۆستا سالار و چێواری خاوەن بەخشش و هاوڕێکانی تریان بە حورمەتەوە تەماشا دەکران، دوای

نسکۆی شۆڕشی کورد، شانۆگەریی (ڕەجەب و پیاوخۆران)ی سمکۆ ناکام گۆمە مەنگەکەی شڵەقاند و وەک سرودێکی نەبەزین و سترانێکی دەستپێکردنەوە ورەیان بە بەری بینەری کورداندا

فایلی شەست و حەوت /١٩٧٦

بەشدارانی شانۆگەریی مۆڵەت/١٩٧٦

کردەوە، لەو شاکارە شۆڕشگێڕەدا کاک چێوار (یوسف) بوو، ئەو کارەکتەرەی بە دەنگی دلێرەوە داوای مافی بۆ زوڵملێکراوان دەکرد و مزگێنیی وریابوونەوەی ڕادەگەیاند، جا بە حەق (چێوار) ساڵانی دوای ئەو مێژووەش هەر (یوسف) بوو، یوسفێکی بەجەرگ و هەقخواز... بەر لە ڕاپەڕین چێوار بووە نموونەیەکی گەورەی هونەرمەندی ژیر و خۆڕاگری کورد و دوای ڕاپەڕینیش لە هەر کوێیەک بە کارایی ڕەنجی کێشابێت، هەمان سیمبول و هەمان کەسە خاوەن کارێزماکە بوو، کە شاگردان و هاوەڵانی لێوەی فێر دەبوون.

### فایلی 67

دوای ناسینی ئەو مامۆستایە، من و هاوڕێکانم لە نزیکەوە سەرنجی تواناکانیمان دەدا و لە ناخەوە دەمانخواست ئێمەی تازە ئەکتەر و نادیار لەسەر نەخشەی شانۆی کوردی، ڕۆژێک لە ڕۆژان نیوەی ئەو چێوارە بە بەهرەمەندییەوە لە حزوری جەماوەردا بوەستین. بڕوا ناکەم ئەو خەیاڵ و خەونە هاتبێتە دی، بەڵام بەخت یارم بوو و زۆری لێوە فێربووم، هەر من نا، بەڵکو ئەکتەرانی دی و شاگردانی دیکەش. ساڵی 1976 بۆ بەشداریی لە فێستیڤاڵی شانۆیی ساڵانەی سەرجەم ئامادەییەکانی شار، ئێمە (خوێندکارانی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ و گروپە شانۆییەکەی ئەو ئامادەییە) بە لێپرسراوێتیی (هاشم شێخ عوسمان) و بەشداریی سەرەکیی گروپەکە (هونەرمەندی ناسراو و بەتوانا ئاشتی عوسمان دانش) ڕوومان لە مامۆستا نا بۆ دیاریکردنی بەرهەمێک بۆمان تا کاری تیادا بکەین و بەشداریی ڤێستیڤاڵەکەی پێبکەین، بە هۆی ناسیاویی (من و ئاشتی)لەگەڵ ئەودا و دڵگەرمیمان بۆ هونەرەکەی، بەڵێنی داینێ و دوای یەک هەفتە (تەنیا یەک هەفتە) تێکستێکی ناوازەی لە وەرگێڕانی خۆی بەو کوردییە دەگمەن و شیرینەیەوە خستە بەردەستمان، کە ئەویش شانۆنامەی (فایلی 67) بوو، لە نووسینی ئیسماعیل فەهد ئیسماعیل. دواتر بەو نووسینانەی لەسەر نمایشەکە نووسران و بە پێی ڕای بینەران و ئەنجامی نمایشەکە لەو فێستیڤاڵە کەدا (یەکەم) بوو و هەردوو ئەکتەرە سەرەکییەکەشی (ئاشتی دانش و بەندە) بووینە باشترین ئەکتەری ئەو ساڵەی فێستیڤاڵ. فایلی 67 وەرچەرخانێک بوو لە نمایشە شانۆییەکاندا، چونکە ناوەڕۆکی تێکستەکە لە خەباتی قوربانیبەخشی گەلی فەلەستین دەدوا، کە وەکو کوردستانەکەی خۆمان بۆ ئازادیی خوێنی دەبەخشی و نوچی نەدەدا، کە لە دەرهێنان و ستایلی کارە هونەرییەکاندا گەلێ تازەگەریی تیابوو، هەرچۆن نواندنیش بە دڵی

بشدارانی درامای پاڵتۆ / تەلەفزیۆنی بەغدا

(چێوار)ی دەرهێنەر بوو، کە هەرگیز سازشی نەدەکرد لەگەڵ نواندنی لاواز و هەرزان و ئەکتەری هەناسەکورتدا. فایلی 67 بەندەی کردە یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانی چێوار، کە بە هۆیەوە لاپەڕەی گەشتر لە ژیانی ئەکتەری و هونەریمدا هەڵدرایەوە و بە هۆی ئەو و هەردوو مامۆستا مەزنەکەی ترمەوە (مامۆستا ئەحمەد سالار و خاتوو بەدیعە دارتاشی خانمی شانۆی کوردی) بۆ چل ساڵ دەچێ خەون و خولیام لە شانۆدا دەبینمەوە و ئەگەر توانیبێتم گوڵێکی بەهرەمەندییم دابێ لە ئێخەی ڕەزامەندیی بینەری خۆم و وەک ئەکتەر و نووسەر لە کاروانی شانۆدا جێگایەکی بچووکم پێبڕابێ، ئەوا چاکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چێوار و دوو مامۆستاکەی ترم، هەر بۆیە تا مەرگ بە ستایشەوە ناو و یادیان بەرز ڕادەگەم.

**بەرەو پێشڕەو**

دوای فایلی 67 (کە چەندین جاری دیکە لە شاخ و شارەکانی کوردستان نمایش کراوەتەوە) چێواری ڕابەر پێشنیازی کرد ببمە ئەندامێک لە تیپی پێشڕەودا و هەروایش بوو. لەوێ زیاتر چێوار و پێشڕەوەکانم ناسی و خۆشبەختانە تا ئەم ساتە خۆم بە دۆست و دڵسۆزی هەر هەموویان دەزانم، لەوێ یەکەم جار بە دەورێکی بچووک بەشداریی (پاڵتۆ)ی گۆگۆلم کرد، کە بووە یەکێک لە دراما سەرکەوتووەکان، تیایدا چێواری ئەکتەر بەشدارێکی سەرەکی بوو.

هەر لەو ساڵەدا (1976) شانۆگەریی (مۆڵەت)ی گەورە نووسەر، محێدین زەنگەنە بووە پرۆژە و دواتر کە لەسەر شانۆ و تەلەفیزیۆن نیشان درا، بوونە یەکێک لە بەرهەمە ناوازەکانی پێشڕەو، شانۆگەرییەکە زۆربەی ئەکتەرانی پێشڕەوی یەک خستبوو، لە ئەکتەرە گەورە و ناسراوەکان

تا دەگات بە ئێمەی لاوی تازە کوڕە، وەرگێڕەکەی مامۆستا شێرکۆ بێکەس و دەرهێنەرەکەی هونەرمەند ئەحمەد سالار بوو، دیسانەوە چێوار یەک لە ئەکتەرە زاڵەکانی کارەکە بوو، بەندە ڕۆڵی سەرەکیی (بەختیار)ی دەدی، بێجگە لە دەرهێنەر، هاوڕێ مامۆستاکانی ترم (چێوار و ئازادی حەمە بچکۆل و هەرەس و عەبدوڵڵا حەمە ساڵح) ئامۆژگارییان دەکردم، بەتایبەت چێواری براگەورە، کە چەند ئێوارەیەک لە دوای پرۆڤە و بە تەنیا لە هۆڵەکە دەماینەوە و مەشقی خەج و سیامەند پێدەکردم و بۆ نمایشێکی باشتر ڕێنمایی دەکردم.
ساڵی 1978 هەر لە پێشڕەودا (خەج و سیامەند)ی کاک فوئاد مەجید میسری بووە پرۆژە، چێوار سیامەند و یاریدەدەری دەرهێنەر بوو، منیش ئەکتەر و بەڕێوبەری شانۆ. زۆر شەو تا بەری بەیان لە هۆڵەکەی سەلاحەدین بۆ ئەنجامدانی دیکۆر لەگەڵ هونەرمەندی گەورە عەزیز سەلیم، کاک سەربەست، مەحمود عەبدولڕەحمان، مامۆستا حیکمەت هندی، هونەرمەندان سیروان جەمال و جەبار مەعروف دەماینەوە و هەموو لە ماندوونەبوونی (چێوار)ەوە وانەی نوێ فێر دەبووین.

## چێوارێکی بەردەوام... چێوارێکی گەورە

هەرچۆن بۆ گاڵتە و لە خۆشەویستیی هەردووکیاندا، بە مامۆستا عوسمانمان دەوت چێواری گەورە و بە جوانەمەرگی شانۆ و هونەرمەندی هۆشیار برایم چێوارمان دەوت چێواری بچووک. لە ڕاستیدا کاک برایم دواتر و بەتایبەت لە (کۆڕی شانۆی با)دا بووە هونەرمەندێکی چالاک و ئەکتەرێکی دیار، هەزار ئەفسووس مەرگ لێی نەگەڕا و لە نیوەی هەورازەڕێدا ڕێی پێگرت.
مامۆستا چێوار هونەرمەندێکی بەردەوام بوو، لەگەڵ تیپی شانۆی کارگەی جگەرەی سلێمانی لە سەرەتای حەفتا و لە تیپی گەزیزە و کۆمەڵ و پێشڕەو و لە چالاکیی قوتابخانەکانی سلێمانی وەک سەرپەرشتیارێکی هونەریی چالاک، وەک دەرهێنەری جوانترین بەرهەمی شانۆی منداڵان (بەیتی ڕێزانکێ، گورگی بێشە و هەرد، داپیرەی دانا) لە نووسینی کاک سمکۆ ناکام، کە یەکەمی سەر ئاستی هەموو عێراق بوون و دەرهێنەری دەیان شاکاری تر، وەک دەرهێنەری شانۆگەرییە دەگمەنەکانی پێشڕەو و سەرجەم شانۆی کوردی، ئەوانیش بریتی بوون لە: (ژیانی ڕۆژانەی قاسم محەمەد 1979، زەلکاوی ماکسیم گۆرکی، ڕاستییەکە مرد، گوڵەمێخەکی ئەدمۆن سەبری، مێوژی بەر خۆر، مرۆڤ و شارەکەی کە

خەج و سیامەند /١٩٧٨

چێوار بكردایە تا لە پرۆگرامی پەیمانگە و ئەكادیمیاكانی هونەریی كوردستاندا بخرانایە بەرچاو و سوود لەو ئەزموونە گەورەیەی چێوار و هاووێنە دەگمەنەكانی وەرگیرایە. دەبوو هۆڵی شانۆ بە ناوی چێوارەوە ناو بنرایە. دەبوو (گروپی شانۆی چێوار) هەلومەرجی پێویستی بۆ برەخسێنرایە، بەتایبەت كە یەك لە جگەرگۆشەكانی مامۆستامان ئەندامی كارای ئەو گروپەیە، بەڵی باشتر گوێ لە خاتوو دالیا چێوار و هاوكارەكانی بگیرایە، دەبوو پەیكەرە بێنازەكەی چێوار لە بەردەركی سەرا گەورەتر دروستكرابایە و ئەو ناوەی برازاندایەوە، دەبوو ئاوڕی زیاتر لە پێشرەو، تیپەكەی چێوار بدرایەتەوە، دەبوو لە ڕۆژی شانۆدا ڕێز لە خانمەكەی (ئەختەر) خانی هاوسەری خەمخۆری چێوار و خوشكی دڵسۆزی ئێمە بدرایەتەوە،كەهەمیشەفەرشی دڵی بۆ پارچە كاغەزەكانی هزر وقەڵەمی چێوار ڕادەخست،ئەوپارچانەی بەرهەمی گەورو گەورەیان لێدەكەوتەوە .. دەبووڕێزی زیاترلە هەردوو كوڕە بەهرەمەندەكەی، میدیاكاری خۆشەویست كاروان چێوار و پەیكەرتاشی ئازیز ڕەنج چێوار بگیرایە.. دەبوو هەر هەمووومان بۆ یاد و ساڵانی پڕ لە خەباتی چێوار زیاترمان بكردایە:

**بەڵام دیارە لە ناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتكار وەكو عەكسی قەمەر وایە لەناو حەوزێكی لیخندا**

چێواری براو هاوڕێ و مامۆستام، یادت بەخێر، هەرگیز ئەو دوو ڕۆژەم بیر ناچنەوە بۆ دروستكردنی ژوورێكی باشتری ماڵەكەت ئێمە (كاك تەحسین قادری برام و كاك برایم چێواری برات و من) بووینە كرێكار و لەگەڵ ئارەقرشتندا ناوبەناو لیمۆیەكی ترشی قسە خۆشەكانت دەداینێ.. ئەو شەوە درەنگەشم لە بیر ناچێتەوە كە دەستم كردە گەردنی پەیكەرە خەمبارەكەت و هاوڕێیەكم وێنەی گرتین، لەو ساتەدا پاسەوانێ ئێخەی هەردووكمان گرت وتی وەختی ڕەسمگرتنە؟ بۆ تۆ ئەمە دەناسیت! منیش لەسەرخۆ و بە پێكەنینە خۆتئاساكەتەوە وەڵامم

لالۆ ڤانیا/ ١٩٨٠

سمكۆ ناكام لە چیرۆكەكانی عەزیز نەسینەوە ئامادەی كردبوو، درندەی تۆرۆسی دووبارە عەزیز نەسین، گوڵعومەر، ئەحەی كرنوو كە نووسینی چێوار خۆیشی بوو/ 1995).

چێوار، شایەنی ئەوەیە چەندین توێژینەوە لەبارەیەوە بنووسرێت، ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار) بەشێكە لەو بەسەركردنەوانەی لە جێگای خۆیاندا دەكرێن و مایەی ستایشە، بەڵام وابزانم هیچی ئەوتۆ بۆ چێواری گەورە نەكراوە. دەبوو كەسانێ كاریان لەسەر بەرهەمەكانی

دایەوە ((ئەی چۆن نایناسم، ئەمە مامۆستای منە، ئەمە ئەو کەسەیە نە لە شار و نە لە دێ، نە لە سەردەمی ژێردەستەیی و داگیرکردنی کوردستاندا و نە لە سەردەمی ئازادیی وڵاتدا تێر تێر هەناسەی شادمانیی هەڵنەمژیوە و هەرگیز پڕ بە دڵ ئۆخەیی نەکردووە... ئەمە چێوارە کە کەفوکوڵی سەرە پڕ لە ئێشەکەی بە چایەک و جگەرەیەک دائەمرکاندەوە..

ئەمە عوسمان چێوارە، کە خەمی مرۆڤایەتیی لە کۆڵ نابوو و چاوی بۆ ئەستێرەیەکی تر دەگێڕا تیایدا حورمەت لە مرۆڤ بگیرێت...ئەی چۆن نایناسم برام))..

19/11/2014

# چێوار و شەقامی دیالۆگ

**ئومێد شێخ حسێن**
**سوید، ئۆپسالا**

لە دوای خۆم دەرگای حەوشەکەمانم توند پێوە دا، بەفر نمەنمە دەباری. بە ناو کوچە و کۆڵانەکانی گەڕەکی چوارباغدا، هێور هێور هەنگاوم دەنا. چاوم لێبوو کوڕوکاڵانی گەڕەک سەرقاڵی شەڕەبەفر بوون.

بەفر لەژێر پێی هەنگاوەکانمدا جۆرە ڕیتمێکی دەچڕی. هەردوو دەستم ئاخنیبووە ناو گیرفانی پاڵتۆ ڕەشەکەمەوە.

خەیاڵم زەفەری پێدەبردم، پێی دەوتم هەق وایە جگەرەیەک داگیرسێنیت.

لەپڕ تۆپەڵە بەفرێک خۆی دەکرد بە نێوانی هەنگاوەکانمدا... جگەرەی لە بیر دەبردمەوە. دواجار خۆم پێنەگیرا و پاکەتی جگەرەکەم لە گیرفانی پاڵتۆکەم دەرکرد، گەڕام بۆ چەرخەکەم، نەمدۆزییەوە. لەبەر

خۆمەوە دەستم کرد بە بۆڵەبۆڵ و وتم دیسانەوە شوان عەتوفە، بۆ داگیرسانی جگەرە چەرخەکەشی بردووە.

ئیدی بە ناچاری لە نێوانی پەنجەکانمدا یاریم بە جگەرەکە دەکرد، لەپڕێکدا کچێکی جوان لەسەر شۆستەکە خلیسکا و بە پشتا کەوت. خێرا چوومە لای و هەڵمساندەوە و پێم وت ئازیز گیان، پەلە مەکە و بە وریاییەوە هەنگاو بنێ. ئەرێ بەڕاست ناوت چی بوو، لە وەڵامدا بە نیگایەکی شەرمنانەوە وتی ئارەزوو. خۆشحاڵ بووم، ملی ڕێگام گرت و دیسانەوە حەزم کەوتەوە سەر جگەرەکێشان و خەیاڵ بردمیەوە بۆ ناو پرۆڤەی خەڵک و بەرد. لەپڕێکدا گوێم لە ناوی خۆم بوو. لەوە دەچوو هاوڕێیەکم بانگم بکات... کوتوپڕ کەسێک لە دوامەوە دەستێکی کێشا بەسەر شانمدا بە پەلە ئاوڕم دایەوە، بینیم چێوارە.

**ئومێد:** ئۆی کاکە چێوار گیان، بمبوورە ئاگام لێنەبوو، خەیاڵم تەزیبوو، چۆنی ئازیز گیان.

**چێوار:** شێخە گیان ئەوە چییە ئەڵێی لەم مەملەکەتەدا نیت؟ دوو جار بانگم کردی، ئاگات لێنەبوو.

**ئومێد:** چی بێت لە تۆ نهێنی بێت؟ بڕوا بکە هەستم نەدەکرد بەسەر دنیاوەم، لە ناو پرۆڤەی خەڵک و بەردا بووم.

**چێوار:** ئەی ئافەرم شێخە گیان، کەی دەست ئەکەیت بە پرۆڤە؟

**ئومێد:** هەفتەی داهاتوو.

**چێوار:** ئەی کێ هاوکاریتان دەکات؟

**ئومێد:** خۆت باش دەزانی چێوار گیان، لێرە هیچ شتێک وەک خۆی نەماوە، شانۆش کەوتووەتە نێوان دوو هێزی دژبەیەکەوە. وا بڕوات ئەم بەرداشە هەمووان دەهاڕێت.

**چێوار:** نانا شێخە گیان، خەمت نەبێ، ئێمەش یاخیبوون هەڵدەبژێرین.

**ئومێد:** وا دەکەین، چونکە شانۆش ئەوەمان لێدەخوازێت... یاخیبوون سەرەتایە بۆ داهێنانی مەزنتر.

**چێوار:** شێخە گیان لە ڕابردوودا هەرچیمان کرد، بۆ نیشتمان بوو. لێرە بە دواوە دەبێت شانۆ بەرینە قۆناغێکی ترەوە.

**ئومێد:** چێوار گیان چەندە سەرسامم پێت... خاوەنی بیرکردنەوەیەکی قووڵیت.

**چێوار:** بە پێکەنینەوە... شێخە بیرکردنەوە کورترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت.

**ئومێد:** قسەکەم بە چێوار بڕی و پێم وت ئەرێ چەرخت پێیە؟

**چێوار:** لە یەکەم جارەوە وام هەست دەکرد خۆتی پێوە خەریک بکەی تا جگەرە تەرک بکەیت.

**ئومێد:** نەوەڵا چێوار گیان، تاکە سەبووریمان لەم دۆزەخەدا ئەم دووکەڵەیە.

**چێوار:** بە خوا ڕاست دەکەیت، من لەگەڵ هەر پێکێکدا یان چایەکی عەنابیدا حەزم لە جگەرەیە.

هەردووکمان پێکەوە سەروجگەرەمان داگیرساند و درێژەمان بە دیالۆگەکەمان دا و بەدەم کزەی سەرما و دووکەڵی جگەرەکانمانەوە ڕووم لە چێوار کرد و پێم وت...

**ئومێد:** ئەرێ کاکە چێوار تیپی پێشڕەو کاری تازەتان بە دەستەوەیە؟

**چێوار:** چی بکەین کاکە ئومێد، هەرچییەک دەکەین، دواتر دێینەوە سەر خاڵی سفر. هیچمان بۆ ناکرێت. نیوەی برادەران سەرقاڵی ڕۆیشتنن بۆ هەندەران. هەرچی عەقڵ هەیە، خەریکە کۆچ دەکات. زۆر ئەترسم بە تەنها بمێنمەوە.

**ئومێد:** ئای چێوار گیان، ئەم ترسەی تۆ... ماڵی بووکەشووشەی بیر خستمەوە کاتێک نورا بە هەموو هێزیەوە دەرگاکە دادەخات... دەخوازێت لە ڕێگەی دەنگی دەرگاکەوە کۆمەڵگە بەئاگا بێتەوە.

**چێوار:** بەڵێ هەرواش بوو، دەنگی دەرگاکەی نورا ڕۆژئاوای بەخەبەر هێنا.

**ئومێد:** بەڵام کێ باکی بە کۆچی ئێمە هەیە؟ ئێرە شوێنێکە بۆ کوشتنی عەقڵ... یان وەک ئۆلگا و چیخۆفمان لێدێت، تەنها بە نامە یەکتری بەسەر دەکەینەوە، یاخود من و تۆش ئەبین بە فلادیمێر و ستراگۆن. لە چاوەڕوانیدا نوقم دەبین.

لەوبەری شەقامەکەوە مامۆستا عەبدولی حەمە جوان دەستی سڵاوی بۆ بەرز کردینەوە. سڵاومان

بۆ سەندەوە. لەپڕێکدا چێوار پاکەتی جگەرەکەی دەرهێنا و سەروجگەرەی ترمان داگیرساند. بەدەم نەفەسی جگەرەکێشانەوە گەشتینە نزیک بەنزینخانەی عەقاری. چێوار ڕووی تێکردم و پێی وتم شێخە گیان، من دەچم بۆ لای سیروان جەمال. ڕەنگە بەم نزیکانە کارێکی تازە بکەین و پێشوەخت قسەم لەگەڵ ئازاد بەرزنجی کردووە، ئەویش قایلە. ئەرێ بەڕاست بیرم چوو پێت بڵێم مامۆستا جەلال تەقی نەخۆشە و لە جێدا کەوتووە. بەم نزیکانە دەچم بۆ لای. پێم خۆشە تۆش بێت لەگەڵمدا.

**ئومێد**: بە چاوان چێوار گیان، ئەزانم ئەشتەوێ بزانی چیی تازەی چیخۆفی وەرگێڕاوە. بەدەم پێکەنینەوە ماڵئاوایمان لە یەکتر کرد. چێوار ڕۆیشت و منیش سەرەوخوار بەدەم هەنگاوی غەریبیمەوە دیسانەوە هاتمەوە بۆ لای.

چێوار؛ ئەوکات لە ناو بەفری نیشتیماندا شوێنپێکانیم بەجێ هێشت. ئەمێستا لە ناو بەفری غەریبیدا شوێنپێکانی چێوار هەڵدەگرمەوە. لەپڕێکدا قاچەکانم دەترازێت و بە پشتا دەکەومە سەر بەفرەکە. ئەوەندە ئەزانم خانمێک دێتە ژێر باڵم و پێم دەڵێت ئاگات لە خۆت بێت ئازیزەکەم. شەقامەکە زۆر خلیسکە. ئەو خانمەی کە بۆ یەکەم جار لە بەفری نیشتیماندا خلیسکا و من چوومە ژێرباڵی و هەڵمساندەوە، ئێستا هەر هەمان ئەو خانمەیە خێزانمە و لەم کەوتنەمدا هاتە ژێر باڵم. سوپاسم کرد و پێم وت ئەم کەوتنە و بوونی تۆ لێرە یادگاریی پیاوێکی وەبیر هێنامەوە، کە ئاستەمە لە بیر بکرێت.

ئەگەر چێوار هونەرمەندێکی مەزن نەبووایە، وا بە ئاسانی نەدەڕژایە ناو ڕووباری شاعیرانەوە. من بۆ خۆم جارێکیان لە دیوانێکی شێرکۆ بێکەسدا بینیم چێوار چوارمشقی لەسەر کورسییەکی شیعری شێرکۆ دانیشتووە و جگەرە دەکێشێ و شێرکۆش شیعر دەخوێنێتەوە. یان جارێکیان لە تووی مەلیک شیعرێکی دلاوەر قەرەداغیم بینی قوڵی لە قوڵی چێواردا بوو، هێمن هێمن دەهاتنە خوار و ئەتریقانەوە.

لە بیرمە هەر کاتێک ڕەووف بێگەرد و جەمال غەمبار بیانویستایە سەردانی چیخۆف بکەن، لە ماڵی چێوار لە باخی گێلاسدا ئەیانبینی.

هەرگیز هاوار و تووڕەبوونەکانی چێوارم بیر ناچێتەوە، کە ئازارەکانی وەک هەڵم ئەچوون بە ئاسمانا.

زۆر جار چێوارم بینیووە نائومێدییەکانی هێندە گەورە بوون، کوردبوون و نیشتمانی بۆ لە یەک جیا نەدەکرایەوە.

چێوار یەکێک بوو لەو شانۆکارانەی کە هەرگیز لە چوارچێوە نەئەدرا و هەیبەت و ئەندێشەی خۆی نەدەدۆڕاند.

ئەم جۆرە لە ئەخلاق کە چێوار و نوخبەیەک خاوەنی بوون، شانۆیان پێ پاراست.

ئەگەر بمەوێت بە جدی قسە لەسەر کایەی شانۆییمان بکەم، ئەوا بێشک بەشێکی زۆری شانۆکاران بە سەختی بریندار دەبن، تاک و تەرای وەک چێوار وەک... ئاگاتۆس... ئەمێننەوە.

**گەلەری چێوار**

ئەوەی بۆ ئێمە مایەوە تەنها وێنەکان تەنها کارەکانی چێوارە

لەگەڵ فوئاد سیروان جەمال

لەگەڵ فوئاد محەمەد وەسمان و ئازادی حەمە بچکۆل و ئاشتی دانش

# عوسمان چێوار لەیادەوەرییەکانمدا

دانا ڕەئووف

لە کۆتایی حەفتاکاندا لە پۆلی یەکی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان بووم. لە پۆلەکەدا دە قوتابی بووین و مامۆستاکەمان، کە هونەری نواندنی پێدەگوتین، فەلەستینی هەبوو. ڕۆژێک لەگەڵ پۆلەکەمان پێکەوە بە گەشتێک هاتین بۆ سلێمانی. ئەوکات سلێمانی لە باری هونەرییەوە پێگە و ناوبانگێکی گەورەی هەبوو، تەنانەت هەر لە دوای بەغدای پایتەختەوە هەژمار دەکرا و زۆر جار لە بەغداوە گەشتی هونەری بۆ سلێمانی دەکرا. بۆ نموونە د. عەونی کەرومی شانۆنامەی (کۆریۆلانس)ی بریشتی لە

هۆڵی ئامادەیی سلێمانیی کوڕان نەمایش کرد، کە بەرهەمی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا، بەشی شانۆ بوو. ئەو بەرهەمە لەسەر ئاستی عێراق و ئەزموونی د. عەونی کەرومی و برێشت ئاماژەی بۆ دەکرا؛ جگە لە بەغدای پایتەخت، تەنها لە شاری سلێمانی نەمایش کرایەوە.

بگەڕێمەوە بۆ سەردانەکەی خۆمان: هێشتا پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە سلێمانی نەکرابووەوە، لەبەر ئەوە، پێشوازییەکی باشمان لێکرا و سەردانی هەندێک شوێنیشمان کرد، لەو بەرهەمانەیشی لەو گەشتەدا دیمان، شانۆنامەی (خاڵە ڤانیا) لە نووسینی چێخەف و ڕێژی ئەحمەد سالار و نواندنی عوسمان چێوار، بەدیعە دارتاش، مستەفا ئەحمەد، سروە عیزەت و سیروان جەمال و... بوو. شانۆگەرییەکە یەکێک بوو لە بەرهەمەکانی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی. نەمایشەکەیش لە هۆڵی ئامادەیی صلاح الدین پێشکەش دەکرا و دەقەکەیش هەر عوسمان چێوار لە عەرەبییەوە کردبووی بە کوردی.

لەبەر ئەوەی دەقەکە (خاڵە ڤانیا)ی چێخەف بوو، چ بۆ مامۆستاکەمان و چ بۆ بەشێک لە قوتابییەکانیش لە باری زماندا هیچ گرفتێکی دروست نەکرد. ئەوان عەرەب و نەمایشەکە بە کوردی و دەقێکی ناسراوی جیهانی، کە لەوەوبەر بینیبوومان و خوێندبوومانەوە و دەمانزانی باسی چی دەکات.

مەکسیم گۆرکی لە دوای بینینی شانۆنامەی (خاڵە ڤانیا) نامەیەک بۆ چێخەف دەنووسێت و دەڵێت: (لەم ڕۆژانەدا سەیری "خاڵە ڤانیا"م کرد، سەیرم دەکرد و ... وەک ژن دەگریام، هەرچەندە من کەسێکی هەستیاریش نیم، بەڵام شانۆنامەکە تووشی حەپەسان و سەرسوڕمانی کردم. بۆیە، کە گەڕامەوە ماڵەوە و نامەیەکی دووورودرێژم بۆ نووسین و ... بەڵام دڕاندم). ئێمە دوای نەمایشەکە نەگرییان، بەڵام نەمایشەکە بە چەشنی گۆرکی (تووشی حەپەسان و سەرسووڕمانی کردین) مامۆستاکەمان لە ئێمە ئەزموونی زیاتر بوو، بە تەمەنتر بوو، کاری باشی زۆر دیبوو، بە بێدەنگییەوە پیرۆزبایی لە کاستەکە کرد و دواتر بە ئێمەی گوت (ئەمە وانەیەکی جوان بوو لە هونەری نواندن، لە ڕێژی و لە پێش هەموو شتێکیشەوە لە چێخەف و لە شانۆی ڕیالیزم).

ئەوەی بینەرانی بەم نەمایشەوە دەبەستەوە، نواندنەکەی مامۆستا عوسمان چێوار بوو. چێوار ڕۆڵی (ڤەینێتسکی) واتە خاڵە ڤانیای دەبینی و ڕیتم و هاوسەنگیی هەموو نەمایشەکەی ڕاگرتبوو، ئامادەبوونێکی بەهێزی لەسەر تەختەی شانۆ هەبوو. تەنانەت لەو کاتانەیشدا، کە لەسەر شانۆ نەدەبوو، ئەو ئامادە بوو. ئامادەییەکی بەهێز، تێگەیشتنێکی قووڵ، هێمنییەکی ئەفسوونی، پەیوەندییەکی سەرنجڕاکێش بە کارەکتەرەکانی ترەوە، مامەڵەیەکی نە زیاد و نەکەم، واقیعەتێکی هونەری و وزەیەکی بەهێز و سەرنجڕاکێش خەسڵەتە بەرچاوەکانی چێواری هونەرمەند بوون. بە ئامادەبوونی ئەو، ئەکتەرەکانی تریش دەبوونە جێگای سەرنج و سەر شانۆکە دەبووە موگناتیز و سەرنجی بینەرانی زۆر بە توندییەوە بە لای خۆیدا ڕادەکێشا و ئەو هونەرە نوێیەی پێناساندین، کە گۆرکی لە نامەکەیدا دەڵێت ("خاڵە ڤانیا"کەی ئێوە شێوەیەکی تەواو نوێی هونەری درامایە، چەکوشێکە ئێوە دەیکێشن بە کەللەی بە تاڵی بینەراندا).

نزیکەی سیوپێنج ساڵ بەسەر ئەو سەردانە و ئەو نەمایشەدا تێپەڕیووە، بە بەراورد بەو دەمە، ئەز خاوەنی ئەزموونێکی دەوڵەمەندترم و چەندین نەمایشی بەرزی چێخەفم لە ئەورووپا و تەنانەت لە ڕووسیا و بە زمانەکەی چێخەفیش دیووە، بەڵام ئەفسوونی عوسمان چێوار و خاڵە ڤانیا و (ڤەینێتسکی)یەکەی ئەوم هەردەم لە یادە. ئەو نەمایشەیش سەرەتای پەیوەندیی من بوو بە دونیای چێخەف و کاک عوسمان چێوارەوە و پەیوەندییەکانمان ئاستێکی پڕ لە ڕێز و خۆشەویستی و دیالۆگی هونەری و تەنانەت کەسێتییشی لەخۆ گرت.

عوسمان چێوار تەنها هەر ئەکتەرێکی بەسەلیقە و بەتوانا نەبوو، بەڵکو ڕێژیسۆرێکی سەرکەوتوویش بوو، کە هەمیشە ڕۆحێکی یاخی و گەنجانەی

هەبوو، بەو ڕۆحە یاخییەی ڕەوتی شانۆی کوردیی گەلێک دەوڵەمەند کردبوو: نەمایشەکانی فۆرمێکی گەلێک جودا، نوێخواز و مۆدێرنی لەخۆ دەگرت، هەر بۆ نموونە، شانۆنامەی (مرۆڤ و شارەکەی)، کە لە هەشتاکاندا نەمایش کراوە، یەکێک بوو لەو ئەزموونە جوانانەی دەبێت شانۆی کوردی شانازیی پێوە بکات. بە فۆرمە ئەزموونگەرییەکەی، بە شێوازە مۆدێرنە پڕ لە جووڵە و گوزارشتئامێزەکەی، بە سینۆگرافیا ئەبستراکتەکەی، کە بووبووە بەشێک لە نەمایشەکە و وێنەکانی مرۆڤ و شارەکەی لە کۆمەڵێک پێکهاتە و جووڵەی ئەکتەر و داڕشتەی سەر شانۆ و پلانە ڕێژییەکەیدا بەرجەستە دەبوون، شانۆیەکی ئەڤانگاردی بۆ ئەو ڕۆژگارەی شانۆی کوردی پێشکەش کرد.
دواتر من و کاک عوسمان چێوار لە هەشتاکاندا، کە لیژنەی ئامادەکاریی (دیداری یەکەمی شانۆی کوردی) بووین، زیاتر لە یەکتر نزیک بووینەوە. لە ماوەیەکی درێژدا، کە خەریکی ئامادەکاریی ئەو دیدارە بووین، من و چێوار و کاک جیهاد دڵپاک لە گەشتی بەردەوامدا بووین، بۆ هەولێر، دهۆک و کەرکوک تا بتوانین زۆرترین پاڵپشت و بەشداریی هەموو شانۆکارانی کوردستان بۆ ئەو دیدارە کۆ بکەینەوە و پرۆگرامەکەی بۆ دابڕێژین. بێگومان چێوار ڕۆڵێکی گەورەی لە ئامادەکردنی ئەو دیدارەدا گێڕا.
هەر ئەوەندە نا؛ عوسمان چێوار کوردیزانێکی باشیش بوو، پسپۆڕی زمانی شانۆ بوو، دەیزانی چۆن زمانی شانۆ بەکار دەهێنێت و بە چ شێوەیەک وشە و ڕستە و دەستەواژەکانی هەڵدەبژێرێت، کە لەگەڵ هونەری نواندن و زمان و ئاستی ئەکتەرەکانیدا بگونجێت.
ئەو دەقە شانۆییانەی ئەو کردوونی بە کوردی، بۆ نموونە دەقەکانی (چێخەف) ئەوانەیشی ئامادەی کردوون بۆ شانۆ، دەڵێیت هەر لە بنەڕەتدا نووسەرەکانیان بە کوردی و بۆ شانۆی کوردی و بۆ ئەکتەری کورد نووسیویانن.
عوسمان چێوار بۆشاییەکی گەورەی لە شانۆی کوردیدا بەجێ هێشتووە، کە تا ئێستایش کەس نەیتوانیووە پڕی بکاتەوە!!
تێبینی:
دەقی نامەکەی مەکسیم گۆرکی، بە هەندێک دەستکارییەوە لە ژمارە ٦٠ی زنجیرەی شانۆی بیانی (خاڵە ڤانیا)ی چێخەفەوە وەرگیراوە، کە لە وەرگێڕانی (شیروان مەحموود محەمەد)ە و لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، ٢٠١٢

### عەبدولی حەمە جوان:

# بە سەرسامییەوە دەمڕوانییە ستایلی کارە ناوازەکانی چێوار

ڕۆڤار

هونەرمەند عەبدولی حەمە جوان، هاوڕێی دێرینی هونەرمەندی کۆچکردوو عوسمان چێوارە. ئەم دوو هونەرمەندە جگە لە ئەنجامدانی چەندین کاری هونەری پێکەوە، هاوڕێی نزیکی یەکتر بوون و زۆربەی ساتەکانی ژیانیان پێکەوە گوزەراندووە، بە گوتەی عەبدولی حەمە جوان، نزیکەی نیو سەدە

**هاوڕێ بوون و کاری هونەرییان پێکەوە کردووە. بێگومان نیو سەدە هاوڕێیەتی پڕیەتی لە بیرەوەری و خەم و ئازار و خۆشیی و شادیی هاوبەش. لەم دیدارە کورتەدا ناوبراو باس لەو پەیوەندییە و کارە هاوبەشانە دەکات، کە پێکەوە ئەنجامیان داوە.**

**ڕۆڤار**: سەرەتا چۆن هونەرمەندی کۆچکردوو عوسمان چێوارت ناسی و هاوڕێیەتیتان دروست کرد؟

عوسمان چێواری هونەرمەند هاوڕێی نیو سەدەی ژیانمە. ساڵی ١٩٦٧ لە پەیمانگەی پێگەیاندنی مامۆستایان لە سلێمانی وەک دوو خوێندکار یەکتریمان ناسی و بووین بە هاوڕێی گیانی بە گیانیی یەکتر و پێکەوە ساڵی ١٩٦٨ یەکەم هەنگاومان بەرەو جیهانی هونەر نا.

**ڕۆڤار**: ئەو سروشت و تایبەتمەندییانە چی بوون، کە عوسمان چێواریان لەلا خۆشەویست کردیت؟

–ئێمە هەردووکمان هاوڕێیەتی یەکتریمان هەڵبژارد، لەبەر ئەوەی بیرکردنەوە و خولیا و بیروباوەڕمان زۆر نزیک بوو لەیەکەوە، تێڕوانینمان بۆ هیوا و ژیان یەک ئاڕاستە بوو. چێوار لاوێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار بوو، منیش هەر لەودا خۆم دەبینییەوە. لە ڕووی ئاستی چینایەتییشەوە وەک یەک وابووین، ئەمانە هەمووی هۆکار بوون بۆ دروستبوون و

گەشەکردنی پەیوەندیی هاوڕێیەتیمان.

**ڕۆڤار**: باسی ئەو کارە هونەرییانە بکە، کە لەگەڵ چێواردا ئەنجامت داون؟

– لە پەیمانگە بۆ یەکەم جار وەک ئەکتەر بەشداریمان لە شانۆگەریی (بڕیار و ئەنجام) کرد، لەگەڵ هاوڕێ هونەرمەندەکانمان حەمەڕەشید هەرەس و کەمال دڵشاد و جەمیل شازەمان و صەلاح صالح و ڕەئوفی حاجی سەعید. دوابەدوای ئەو کارە (تیپی خەبات)مان دروست کرد، کە دیارە بیرۆکەی عوسمان چێوار بوو. هەروەها چەند بەرهەمێکی شانۆییمان لە کەرکوک و سلێمانی نمایش کرد وەک (فەرهادی شۆڕشگێڕ و کاوەی ئاسنگەر و چەتۆخان) کە کاریگەریی چێواریان وەک دەرهێنەر و نووسەر و ئامادەکار بەسەرەوە بوو بە هاوکاریی حەمەڕەشید هەرەس؛ ئێمەش وەک ئەکتەر بەشداریمان تیادا کرد لەگەڵ مستەفا ئەحمەد. هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی ساڵی ١٩٧٠، لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵ پێکەوە بەشداریمان کرد لە شانۆیی "پێنج کەس لە ئوتێلێکدا". دوابەدوای ئەم کارە چێوار لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی وازیان لە کۆمەڵ هێنا و تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردییان دروست کرد، تا ساتی دواماڵئاوایی کاریزمای ئەو تیپە بوو. من هەر لە کۆمەڵ مامەوە. ساڵی هەشتاکان، ئەو داوای لێکردم لە شانۆیی "گوڵ عومەر" بەشداری بکەم. ئەوە بوو بۆ زیاتر لە دوو مانگ پڕۆڤەمان کرد، بەڵام ڕژێم ڕێگای نەدا ئەو شانۆییە نمایش بکرێت، کە لە دەرهێنان و ئامادەکردنی خودی عوسمان چێواری هونەرمەند بوو.

دوو کار کە بە سەرپەرشتیی چێوار بوو، لەسەر داوای ئەو هاوڕێیەم ساڵی ١٩٩٢ بەشداریم کرد لە فیلمی "بەهەشتی سووتاو" کە بەرهەمی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی بوو.

کۆی کارکردنم لەگەڵ چێوار لە کاری هونەریدا حەوت کار بوون بە شانۆیی "گوڵ عومەریشەوە".

**ڕۆڤار**: تێڕوانینی خۆت وەک هونەرمەندێک بۆ هونەرەکەی چێوار چی بوو؟

– ئەوەی شارەزا و بینەری کارە هونەرییەکانی عوسمان چێوار بێت، دەزانێت عوسمان چێوار چ هونەرمەندێکی بەسەلیقە و بەهرەدار و لێهاتوو بووە. من زۆر بە سەرسامییەوە دەمڕوانییە ستایلی کارە ناوازەکانی هونەرمەند چێوار، کە زۆرجار خەونی هونەریی هەموومانی تیادا بەرجەستە دەکرد.

**ڕۆڤار**: لە لای تۆ چ شتێک هونەرەکەی عوسمان چێواری لەوانی دیکە جیا دەکردەوە؟

– ئەزموونی هونەریی عوسمان چێوار هەمیشە بەردەوام بوو، چ لە شانۆی منداڵان کە خاوەنی چەند مەدالیای سەرکەوتن بوو لەسەر ئاستی عێراق و چ کارەکانی لە ناو تیپی پێشڕەو و چالاکیی قوتابخانەکان. چێوار تەنها لەسەر یەک ستایل کاری نەدەکرد، بەڵکو ئەزموونەکانی لە کۆمەڵێک ستایلی جیاوازدا نمایش دەکرد. هەمیشە دەگەڕا بە شوێن ئەزموونی نوێدا، ڕاوەستاو نەبوو، خودی خۆشی هەمیشە لە هەوڵدان و گەڕاندا بوو بە دوای کاری نوێ و سوودوەرگرتن لە ئەزموونی ناوچەیی و جیهانی. تەنانەت بەشداریی لە هەموو خولێکی هونەریی شانۆیدا دەکرد لەگەڵ هاوڕێکانی لە شاری بەغدا. ئەوەی گرنگە، ئەوەی خۆی فێری دەبوو، دەیگەیاندەوە بە ئێمەش، وەک هاوڕێی هونەریی ئەو هونەرمەندە نەمرە.

**ڕۆڤار**: مەرگی چێوار لای تۆ چ کاردانەوەیەکی هەبوو؟

– من لە تۆ دەپرسم دەبێت کۆچی دوایی هاوڕێیەکی مەزنی وەک عوسمان چێوار چ

کارەساتێک بخولقێنێ لە هەست و هۆش و دڵتدا؟ ئەو ساتەی ئەو هەواڵەم بیست، دنیام لەبەرچاو تاریک بوو و زەمەن لای من وەستا. ئەو ئێوارەیە دیدارمان هەبوو وەک یەکێتیی هونەرمەندان لای بەڕێز مام جەلال. هەواڵی کۆچی دوایی و ماڵئاوایی چێوار هەموو دیدار و کارەکانمانی ڕاوەستاند. ئای کە هەواڵ و ڕۆژێکی ناخۆش بوو لای من. جارێکی تر هەواڵی شەهیدبوونی ماجیدی برام دووبارە بووەوە. بە داخەوە بۆ لەدەستدانی خۆشەویستەکانم.

**ڕۆڤار**: پێت وایە بە مردنی چێوار گۆشەیەک لە هونەری کوردی بە بۆشایی مایەوە و پڕ نەکرایەوە؟

– یەک عوسمان چێوار هەبووە و هەرگیز عوسمان چێوار دروست نابێتەوە. بڕوا ناکەم ئەو کەلێنەی ئەو لە نێو هونەری کوردیدا دروستی کرد، تا ئەبەد پڕ بکرێتەوە.

**ڕۆڤار**: پێت باشە چی بکرێت بۆ ئەوەی یادی هونەرمەند و ئەدیبە کۆچکردووەکان بەرز ڕابگیرێت و لە یاد نەکرێن؟

– هەرچی بکرێت بۆ بەرزڕاگرتنی یادی هونەرمەند و ئەدیبە کۆچکردووەکان، گرنگە. وەک ئەرشیفکردنی ژیانیان و پاراستنی کەلوپەلە تایبەتییەکانیان لە مۆزەخانەیەکی تایبەت و مەزندا، لەگەڵ ناونانی باخچە و شەقام و شوێنە گشتییەکان بە ناویانەوە و لە سەرروو ئەمانەشەوە ئاوڕدانەوە لە خانەوادەکانیان، ئەمەش ئەرکی دەزگا تایبەتییەکانی دەوڵەتە.

دواقسەم بۆ ئەم کارە پیرۆزەی دەزگای سەردەم و بەتایبەت گۆڤاری (ڕۆڤار)، بە هیوای بەردەوامیتانم و سەرکەوتوو بن.

# عوسمان چێوار:

## من بۆ خۆم مەبەستم نییە
## لە ئەزموون و داهێنان بدوێم

**دارشتنەوەی ڕۆڤار**

**ساڵی 1993 پاشکۆی ئەدەب و هونەر ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ هونەرمەندی کۆچکردوو عوسمان چێوار ساز کردووە. لە پێشەکی ئەو چاوپێکەوتنەدا نووسراوە: هونەرمەند عوسمان چێوار چالاکییەکی دیاری لە حەفتاکان و ناوەڕاستی هەشتاکاندا وەك ئەکتەر و دەرهێنەر و وەرگێڕ لە پانتایی هونەری کوردیدا ئامادەییەکی دیاری هەبووە. بۆیە پاشکۆی ئەدەب و هونەر بە باشی دەزانێ، بۆ ئەوەی بازنەی دوورەپەرێزیی هونەرمەند بشکێنێ، ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ ساز دا.**

عوسمان چێوار زیاتر لە ئەزموون و شێوەیەکی شانۆییدا کاری کردووە لە جیهانی چیخۆفەوە پەڕیوەتەوە بۆ گۆرگی و ڕیالیزمی و سۆشیالیستی بۆ شانۆی مەلحەمی بۆ واقیعیەتی سیاسی و کۆمیدیای ڕەخنەگرانە... دیارە هەریەک لەم شێوازانەش ئایدیۆلۆجیا و شێوەی هونەریی تایبەتی پیادە کردووە، لێرەدا ڕۆژنامەنووسەکە دەپرسێت: ئایا لە نێوان ئەمانەدا شوێنی فیکری و هونەریی عوسمان چێوار کەوتووەتە کوێوە؟

عوسمان چێوار لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا وتویەتی: لە شانۆیی مرۆڤ و شارەکەیدا لە گۆرانیی پاش پەردەی دوالوتکەی شانۆییەکەدا، گۆرانیبێژ ئەڵێ: بەڕێز بینەر، کە لەم هۆڵە دەرچوویتە دەر، دەچییە کام سەر؟ کامە ڕێگا ئەگریتە بەر. من یاریی گوریسپچڕێنەی لای خۆمانم کردبووە تەوەری بەرجەستەکردنی ململانێی بەردەوامی نێوان تێرەکان و برسییەکان. جا بەندە لەو شانۆییە جۆراوجۆرانەدا وا ناویانت بردووە، هەر لە لایەک دەستم گرتووە و لەسەر یەک لا بووم و هەر ئەوەش (بیرم) بووە. لە هەموو شانۆییەکانیشما هەر بۆ ئەو بیرە فرمانی درامیم بەرجەستە کردووە، جا ئەو شانۆگەرییانەی وا دەورم تیا بینیوون یان تەرجەمەم کردوون یان دەرمهێناون دەشێ چەند شێوازێکی هونەریی جۆراوجۆرم پەیڕەو کردبێ، بەڵام ئایدیۆلۆژیا و بیری جۆراوجۆرم نەبووە، بیریش بە ئیدیعاکردن نابێ و نییە، بەرهەمە هونەرییەکانم پێناسەمن، نەک لە هیچیان پەشیمان نیم،

بەڵکو شانازییشیان پێوە دەکەم.
چێوار ئاماژە بەوەش دەکات، کە پەیڕەوکردنی شێوازە هونەرییە جۆراوجۆرەکان هەروا لە خۆوە نەبوون، بەڵکو بۆ ئەوەی بینەر زیاتر و زووتر هەست بە جۆری پەیوەندییەکان بکات، پاشان وەک تەکنیک هەر شێوازێک کاڵای پڕ بە باڵای بەرهەمەکە بووە لە کات و ساتی خۆیدا.
هەر لەو دیدارە هونەرییەدا هاتووە "عوسمان چێوار یەکێکە لەوانەی کە لە دامەزراندنی شانۆی کوردیدا جێ هەوڵی دیارە، بەڵام دواتر ئەم دامەزراندنە بە سەرەتایەکی تەقلیدی دانرا، بەتایبەتی بە لای کۆمەڵی هونەرمەندی گەنجەوە، ئیتر ناوی عوسمان چێواریش نەبەسترایەوە بەو گۆڕانکارییە شکڵییانەی لە پرۆژەی شانۆی کوردیدا کرا". پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئەوە مانای ئەوە نییە کە کەمتر ڕۆحێکی نوێخوازی و ئەزموونگەرییانەی هەیە؟
چێواری نەمر لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت: زۆرم پێ خۆشە کە ناوی بەندە بەو گۆڕانکارییە شکڵییانەوە نەبەستراوەتەوە، چونکە ئەوەی وا ناونراوە ئەزموونگەریی نوێخوازی و شکڵیەتی بێبنەمای فکری، لاسایی کوێرانەی مەغریبی عەرەبی و گواستنەوەی بەرهەمە تەشکیلییەکانی بەغدا بووە و هیچی تر.
عوسمان چێوار پێشی وابووە ئەزموون و داهێنانی شکڵی نوێ دەبێ لە ناو خودی بزووتنەوەی شانۆی کوردی خۆیدا لەدایک بێ، بەتایبەت بۆ ئەوانەی وا زۆر بە پەرۆشی شانۆی کوردییەوەن، ئەوانەی وا بە تەنها بیر لە فۆرم و شکڵیەت دەکەنەوە و دەیانەوێ بەوە چاو و ڕاوێ لە خەڵک بکەن، ئەوە کۆشکی خەونەکانیان لەسەر ئەرزێکی فشەڵ بنیات دەنێن و دەڵێت: خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی زانستی لەو مەسەلەیە بدوێین، تەنها بە مەبەستی دراسەکردن نەبێ، ناتوانین فۆرم و ناوەڕۆک لێک جیا بکەینەوە، بە نموونە، شانۆی برێخت وەزیفەی کۆمەڵایەتیی

هونەری لە تەفسیرەوە بۆ گۆڕان هێنایە گۆڕێ، ئەوە ئەزموون بوو، ئەوەش داهێنان بوو.
لەو چاوپێکەوتنەدا لە چێوار دەپرسن: شوێنی عوسمان چێوار لە نێوان ئاهەنگساز و ئەزموونگەرییەکاندا لە کوێدایە، کە ئەم دووانە دیارترین تەوژمی شانۆی کوردین؟
لە وەڵامدا وتویەتی: لام وایە هونەرمەند نابێ بۆ خۆی بانگەشە بۆ ئەزموون و داهێنانی خۆی بکات. من زۆرم لەو هونەرمەندانە دیووە کە لەگەڵ ڕۆژنامەنووسەکاندا ڕێک دەکەون و چاوپێکەوتن و دیداریان بۆ خۆیان دروست دەکرد و بە شان و باهۆی بەرهەمەکانی خۆیاندا هەڵیانئەدا، تا ئەو ڕادەیەی پرسیاریان لە خۆیان دەکرد و هەر خۆشیان وەڵامیان ئەدایەوە. بەوە تا ماوەیەک خۆشیان و بینەران و خوێنەوارانیشیان هەڵدەخەڵەتاند.
بەڵام بە بڕوای عوسمان چێوار، ئەمە لە مێژوودا ناڕوات. جا بۆ ئەم پرسیارە ئەگەر مەسەلە پێداگرتن بێ لای ئێوە، ئەوا ئەڵێم من بۆ خۆم زۆر مەبەستم نییە لە ئەزموون و داهێنان بدوێم، بەڵام ئەوانەی وا زۆر مەبەستیانە، با ڕۆژ و مانگ و ساڵی نمایشی مرۆڤ و شارەکەی بدۆزنەوە، ئینجا باسی ئەو بەرهەمانە بکەن، کە بە دوای ئەودا هاتوون و ناوی ئەزموون و داهێنانیان لێنراوە. ئێمە قسە بە دەم مردووەوە ناکەین، بەرهەمەکە تۆمار کراوە (مرۆڤ و شارەکەی) فۆرمێکی نوێی بێناوەڕۆکیش نییە.
گرفتێکی سەرەتایی شانۆی کوردی نەبوونی دەقە، کە شوناسنامەی شانۆیە و بەبێ ئەوە شانۆ تەنها پرۆژەیەکی هونەری و تەکنیکییە. پرسیارەکە ئەمەیە: ئایا پرۆژەیەکی تایبەتی شانۆی کوردیمان هەیە یاخود شانۆکەمان لە ئاستێکدایە کە بتوانین بیکەینە هەویەی خۆمان؟
عوسمان چێوار زۆر بە کورتی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: ئەوانەی وا زمانە زیندووەکان ئەزانن، با شانۆگەرییەکانی سمکۆ ناکام تەرجەمە بکەن، ئەوسا بە کردەوە ئەیسەلمێنن کە پێناسەمان هەیە یان نا.
لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە دەڵێت شانۆی کوردی قەرزاری شانۆی جیهانییە، چ لە ڕووی دەق و چ لە ڕووی تەکنیکەوە، ئایا شانۆی کوردی چیی داوە بە شانۆی جیهانیی یان هیچ نەبێت بە دەوروبەری خۆی؟
چێوار قسەیەکی ئارسەر میللەر دەهێنێتەوە، کە بە بۆنەی ڕۆژی جیهانی شانۆوە کردوویەتی و وتویەتی (خەڵکی ئەرکێکی زۆر دەکێشن تا بتوانن ساڵانە لە هەموو جیهانا ئاهەنگی جۆراوجۆر بۆ بیروباوەڕە بەرزەکان بگێڕن، وا ئەمڕۆش لە وڵاتانی جۆراوجۆر و لە یەک کاتدا ڕۆڵی گرنگی شانۆ بەڕێوە دەچێ و دەچەسپێ. ئەمەش مانایەکی قووڵی هەیە، ماناکەش ئەوەیە کە شانۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان سیمای جیهانیی خۆی ون نەکردووە) چێوار دواتر دەڵێت: ئەو پیاوە وای وتووە و هەرواشە، بەو پێیە ئێمە لەو قەرزە گەردنمان ئازاد ئەبێ، دەنا گەر وانەبێ، هەموو قەرزاری گەلی گریکین.
لێی دەپرسن عوسمان چێوار لە دوو قۆناغی جیاوازدایە، ئەکتەر و دەرهێنەر، وەرگێڕ، کەسێکی چالاک و دیار لە حەفتاکان و ناوەڕاستی هەشتاکاندا، بەڵام تا ڕادەیەک دوور و کەم بەرهەم لە دوای ئەو قۆناغەوە؟
ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەگەر هونەری شانۆ وەک هونەری شێوەکاری بەڕێوە بچوایە، شتەکە وا نەدەکەوتەوە. ئەوەندەش دوورەپەرێز نیم وەک ئێوە ئەفەرموون.
یەکێکی تر لە پرسیارەکان ڕووبەڕووی چێوار کراوەتەوە. لەو چاوپێکەوتنەدا دەڵێت: لە کاتێکدا شانۆی کوردی سەرگەرمی ئەزموونگەری و ڕەمز و قووڵبوونەوەی هەندێ ئیشکالیاتی هونەری شانۆ بوو -تۆ لەو ساتەدا (دڕندەی تۆڕۆس)ت پێشکەش کرد، کە شانۆیەکی واقیعیی کۆمیدیئامێز و سادە لە ڕووی تەکنیکەوە بوو- ئەم شانۆیە لە ساتی خۆیدا سەرکەوتنی بە دەست هێنا، بەڵام هەندێک پێیان وابوو کە عوسمان چێوار هێشتا هەر لە ناو قاڵبە هونەرییە تەقلیدییەکان دەرباز نەبووە!! تۆ ئەڵێی چی؟ ئایا پێت وابوو کە ئەو دۆخە شانۆییە واقیعییەت دەربازی دەکرد؟
چێوار زۆر بە کورتی وەڵام دەداتەوە: ئەگەر بەر

لە دڕندەی تۆڕۆس شێوازی هونەری ترم، وەک ئەوانەی وا لە پرسیاری یەکەمدا ناو ئەبەی، پەیڕەو نەکردایە، ئەوا ئەوانەی وا ئەڵێن لە کاری تەقلیدی دەرباز نەبووم، ڕاستیان دەکرد.
زیندووترین کاراکتەرێک عوسمان چێوار بەرجەستەی کرد، دنیای چیخۆف بوو، کەسایەتیەکی ماندوو و قوربانی و هەستپێنەکراو، لە لایەکی تریشەوە عوسمان چێوار زیاتر جەماوەرێکی زۆر لە کەسایەتییەکی میللیی ناوچەییدا ئەیبینێتەوە وەک ئەو حاجییە لادێیە هەلپەرستەی مۆڵەت وا بە عەقڵی لادێی پەلاماری شار ئەدات... پرسیارەکە ئەمەیە ئایا لە نێوان ئەو دوو شێوازە جیاوازەی نواندنە عوسمان چێوار خۆی لە کوێدا دەبینێتەوە؟ ئایا نواندن لای تۆ چی ئەگەیەنێ؟ تا چەند مەودای سایکۆلۆژیی کاراکتەر و ئەکتەر کاریگەرن بۆ یەکتری لە نواندندا؟
بە بۆچوونی چێوار ئەکتەری سەرکەوتوو ئەو ئەکتەرەیە، کە دەقگری ڕەت دەکاتەوە و زوو زوو قاڵبەکان دەشکێنێ، هەر کارەکتەرێکی نوێ لە ژیانی ئەکتەردا تاقیکردنەوەیەکی نواندنی نوێیە، ئەمانەش هەمووی پابەندی ڕۆشنبیری و ڕاهێنان و شێلگیری و زیرەکیی ئەکتەرەکە خۆیەتی. ئەکتەر بۆ خزمەتی کارەکتەر هەندێ لە (زاکرەی انفعالی)ی خۆی بە گیانی کارەکتەرەوە موتوربە دەکات. ئەگەر وا نەکات، با لە هەموو شتەکانی تریشدا سەرکەوتوو نەبێت، ناتوانێ نواندنێکی بەتاموبۆ بۆ بینەرەکەی پێشکەش بکات، ئەکتەر ئەبێ سەکۆی بەهاکانی دراماتیک (شتە جوان و بزوێنەر و چێژدارەکان)، لە نواندنەکەی خۆیدا ببینێتەوە، ئەوجا وەک ئەکتەرێک سەرکەوتوو ئەبێ.
پرسیارێکی تر کە لەو کاتەدا، واتە ساڵی 1993 لە چێوار کراوە، ئەوەیە: واقیعی ئێستای شانۆی کوردی دڵخۆشکەر نییە و ئەم ساتە بە ئەزمەی شانۆی کوردی دائەنرێت، هیچ پرۆژەیەکی جیدی دیار نییە. کارەساتەکەش لەوەدایە کە ئەمە دوای ڕاپەڕین ڕوو ئەدات... واتە دوای ئازادی، کە وەزعی شانۆی کوردی پێش ڕاپەڕین باشتر بوو... ئەبێ هۆکاری ئەم ئەزمەیە چی بێت؟! ئایا ڕاپەڕین چیی بە شانۆ بەخشی و چیی لێسەندەوە؟
لە وەڵامیکی کورت و پوختدا وتویەتی: ئەو واقیع و ئەزمەیەی وا ئێوە ناوی ئەبەن، منیش هەروای دەبینم، بەڵام بە کەمێ گەشبینییەوە.
لە بەشی کۆتایی ئەم چاوپێکەوتنەدا پرسیارەکان و وەڵامەکان تەواو کورت دەبنەوە، بەم شێوەیە:
**پرسیار:** ئێستا دەزگای تەلەفزیۆنی جێگەی شانۆی گرتووەتەوە، ئایا ئەوەش دیسانەوە لەدایکبوونێکی ناکامڵی ئەو بوارە نییە...؟ بۆ خۆی ئەزمەی تر ناخوڵقێنێ؟
**وەڵام:** تیپە شانۆییەکانی کوردستان بە تیپی پێشڕەویشەوە لەو واقیع و ئەزمەیە بەرپرسیارن.
**پرسیار:** ئێستا تیپی پێشڕەو سست و لاوازە – لە لایەکی ترەوە تەلەفزیۆن کادرەکانی لێ فڕاندوون.. ئایا چۆن ئەتوانرێت ئەو تیپە بگەڕێتەوە بۆ سەر مەداری خۆی؟
**وەڵام:** ئەگەر شانۆ خۆی هەبێ، ئەوا درامای تەلەفزیۆنی ناتوانێ جێی شانۆ بگرێتەوە.
**پرسیار:** ئێستا عوسمان چێوار خەریکی چییە؟ وەکو ژیان، وەکو کاری هونەری پەیوەندیی بە سیاسەتەوە و پەیوەندیی بە ڕێکخراوی هونەرمەندانەوە.
**وەڵام:** ئەژیم، ئێستا خەریکی فیلمێکی پەروەردەیی منداڵانم بە ناوی گوڵە پەلکەزێڕینە. ئەم درامایە چیرۆکی (کاتایف)ە و مامۆستا عومەر عەلی ئەمین ئامادەی کردووە و سیناریۆی بۆ نووسیوە. مامۆستا صلاح رەئوفیش ئاواز و مۆسیقای بۆ داناوە.
کەسێکی بێلایەنم و پەیوەندیم بە هیچ حیزب و ڕێکخراوێکەوە نییە.

چێوار
ڕۆژگار

**چێوار** لەگەڵ دەستەیەک لە هونەرمەندانی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی

عوسمان چێوار

# ساڵە بەپیتەکان

سمکۆ ناکام

تفەنگی حەوت باوکتان بیستووە؟ ئەمە کاتی خۆی بە تفەنگێ ئەگوترا، کە هەریەک لە پێکهاتەکانی پارچەی تفەنگێکی لەکارکەوتووی تر بوو، چەخماخسازێکی وەستا چەکێکی نوێ و نیشانشکێنی لێ ئەهێنایە دی. کاتێ ساڵی ١٩٧٣ تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی وردەوردە ڕوخساری بۆ پەیدا ئەبوو، ئەندامەکانی لە فرەلاوە لەم تیپە نوێیەدا گیرسابوونەوە: ڕەووف حەسەن، تەها

باراوی، ئازادی حەمە پچکۆل، مستەفا ئەحمەد، ئازاد جەلال، بەندە و یەک دووانێکی تر پێشتر لە کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردیدا ئەندام بوون. لە هاوڕێیانی گەزیزەوە کەمال سابیر، عەبدوڵڵا حەمە ساڵح و حەسەن تەنیا هاتن. عوسمان چێواریش بەر لەمە لە تیپی کارگەی جگەرەدا چالاک بوو. لەو ڕۆژانەوە چێوار نە تەنها ناسیاوێ، بەڵکو بوو بە هاوڕێیەکی نزیکم.

تیپ لە یەکەم بەرهەمیدا کە خۆی بۆ ئامادە ئەکرد و پێشکەش نەکرا، دووبەرەکی کەوتە ناو ئەندامەکانییەوە. دەستەیێ (باراوی سەرقافڵە بوو) گلەیی ئەوەی ئەکرد کە مەبەست لە پێکهێنانی ئەم تیپە نوێیە ئەوە بووە، کە بەرهەمەکانی جیا بێ لەوانەی کۆمەڵە هونەرییەکانی تر: کۆمێدیا زۆر چاک ئەشێ، بەڵکو پێویستە جیددی بێت، شوێنی تەهریج و سواڵی پێکەنین ژێر خێوەتی سێرکە، نەک سەر تەختەی شانۆ. قسە خۆشەکانی "فەریقە کوێر" قۆشمەن، بەڵام شانۆنامە نین. لەوساوە گومانێ پەیدا بوو کە مەبەستی هەندێ لە دامەزرێنەران هەر لە بنەڕەتدا ئەوە بووە، کە دەست بگرن بەسەر تیپە ساواکەدا و بۆ هەڵزنانی شەخسیی خۆیان بەد بەکاری بێنن. ڕێڕەوی ڕووداوەکان پاشتر دروست بۆچوونی ئەم گومانەی سەلماند.

ئەوەی تیپی لە لەبەریەکهەڵوەشان پاراست، دروستبوونەوەی جەنگ بوو لە کوردستاندا لە ساڵی ١٩٧٤دا. زۆربەمان بەرەی گەلمان هەڵبژارد و چووین بووین بە پێشمەرگە. من وەک زۆربەی کاتی دوو ساڵ پێشمەرگایەتییەکەی پێشترمدا (١٩٧٠-١٩٦٨) لە باڵەکایەتی لە نزیک باوکمەوە مامەوە. ئەندامەکانی تر چوونە ڕیزی "تیپی شانۆی شۆڕش"ەوە، کە بۆ مەبەستی پروپاگەندە دامەزرابوو و بارەگاکەی لە گوندی "بناوە سووتە"ی نزیک پێنجوێن بوو. یەکەم و هێندەی من بزانم، تاکە بەرهەمی ئەم تیپە ئامادەکردنێک، یاخود ڕاستتر بڵێین ئابڕووبردنێکی کورتەچیرۆکی "چاڵی جەرگی پیرێژن"ی حسێن عارف بوو. شانۆگەرییەکە پڕ بوو لە کلکەلەقێ بۆ ساواک، تا ئەگاتە شیرەشیرێ: زیندە باد شاهەنشاهـ ئاریا میهر! چوار ئەندامی تیپی پێشڕەو (چێوار، باراوی، عەبدوڵڵا و مستەفا) بە عالەمی ئاشکرا ڕەتیان کردەوە لەم هەرزە بەرهەمەدا بەشداری بکەن و ڕایانگەیاند کە ئەوان بۆ خزمەتی گەلەکەی خۆیان بوون بە پێشمەرگە، نەک بۆ ئەوەی ببن بە شایەری حەمە ڕەزای پەهلەوی. ئەم هەنگاوە مەترسیی لێپرسینەوە و بانگکردن بۆ "پاراستن"ی بە دوای خۆیدا ئەهێنا. بەڵام ئەو چوار هونەرمەندە سام دای نەگرتن و لە بڕیارەکەیان پەشیمان نەبوونەوە. ئەم هەڵوێستە مەردانە و بەویژدان و بوێرەی ئەو چوار ئەندامەی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی شایستەی ئەوەیە هەرگیز لە یاد نەکرێت. من خۆم ئەم بەرهەمەم لە "حاجی هۆمەران" دی و ئاگام لێبوو چۆن لە کۆتاییدا کاک حسێن عارفی نووسەر بەدەم هێڵنجدانەوە خۆی گەیاندە کارگێڕانی شانۆگەرییەکە و بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسین: بە چ مافێ ناوی منتان لەسەر ئەم بابەتە داناوە، من کەی شتی وام نووسیوە؟

پاش ئاشبەتاڵە چاوەڕواننەکراو و بڕبڕەی پشتشکێنەکەی ١٩٧٥ و گەڕانەوەمان بۆ شار، هەمووومان لە تیپدا کۆک بووین لەسەر ئەوەی دوو هێڵی ڕاستوچەپ بەسەر ڕابوردوودا بکێشین و لە سفرەوە بکەوینەوە کار. بەڵام بەدگومانی بە تەواوی نەڕەوییبووەوە. ساواک دانیشە بەخێر و مونەززەمە چاوم ڕوون!

یەکەم بەرهەم من وەک نووسەر و چێوار وەک کارگێڕ ڕاستەوخۆ گەیاندمانە بینەران، شانۆگەریی منداڵانی "بەیتی ڕێزانکێ" بوو (١٩٧٦). سەرکەوتنی شانۆگەرییەکە هەموو سنوورێکی بەزاند و لە فێستیڤاڵی ساڵانەی چالاکیی قوتابخانەکانی سەرتاسەری عێراقدا پلەی یەکەمی بە دەست هێنا. ئەمە بۆ چێوار بووە پاڵپشت خۆی وەک کارگێڕێکی پسپۆڕ و لێهاتوو بدا بە ناسین و جێگەپێی خۆی پتەوتر بکا. مایەی بەبیرهێنانەوەیە کە سەرکەوتنی بەیتی ڕێزانکێ بەو ڕادەیە دژوار بوو بە دەست بێ، ئەگەر بەشداریکردن و هاوکاریی هاوڕێی مۆسیقارمان "دلێر برایم" نەبووایە، کە ئاوازی گۆرانییەکانی هۆنیبووەوە و سەرپەرشتی و

ڕابەریی "تیپی مۆسیقای منداڵان"ی ئەکرد، کە هەر خۆی هێنابوویە ئاراوە. جێی داخە ئەو ڕۆژگارە گەش و شاد و پڕ لە تریقەیە ساڵێ پاشتر بە تراژیدیای قەدەرێکی ئۆتومبیل وێنەکەی بۆ هەمیشە تەڵخی دایئەگرێ. هاوکاریی من و چێوار لە بواری شانۆی منداڵاندا دوو ساڵی پاشتریش هەر بەردەوام دەبێ.

ئەوەی من لە کارگێڕانی چێواردا سەرنجم دابوو، ئەوە بوو کە ئەو زۆر ڕێزی لە شانۆنامەکە ئەگرت. بە دەگمەن نەبێت، دیالۆگی لە گیرفانی خۆی دەرنەئەهێنا. پێش دەسکردن بە پرۆڤە، چێوار بە قووڵی ئەچووە بنجوبناوانی بابەتەکەوە و تێکستەکەی شی ئەکردەوە. بۆیە بەر لەوەی دەورەکان بە سەر ئەکتەرەکاندا دابەش بکات، هەر لە سەرەتاوە وەک ئەندازیارێک دیمەن بە دیمەنی شانۆگەرییەکەی لەبەرچاو بوو. هەرگیز ڕێک نەکەوتبوو چێوار دەست بداتە پرۆژەیێ بێ ئەوەی پێشتر دەقەکەی خوێندبێتەوە و بۆچوونی خۆی تیا دەستنیشان کردبێ. ئەمە بە پیرۆزڕاگرتنی هونەرەکە نەبوو بە تەنها، بەڵکو ڕێزگرتنیش بوو لە بینەران. پشتئەستوور بە ڕۆشنبیرییەکی تۆکمە، بەهرەی چێوار خۆڕسک و بەتوانا بوو. لە ڕووی سیاسیشەوە چێوار لە بەرەی ڕەشەخەڵکەکەدا بوو، بەڵام ئیلتیزامی بە هیچ حیزبێکەوە نەبوو، یاخود من ئاگادار نەبووم. چێوار نەیاری سەرسەختی ڕژێمی تکریتییەکان بوو، بۆیە تا ئاوابوونی دەسەڵاتی بەعس لە سلێمانیدا جارێکیش ڕێک نەکەوتبوو چێوار

له جەژنی لەدایکبوونی سەددامدا بە چەفتەی مەلیکییەوە دابەزێتە سەر جادەو پیرۆزبایی لە ڕیفاق بکات.
دوژمنی سەرەکیی من و چێوار سانسۆر بوو. بۆیە، سەرەڕای ئەو هەموو فێڵوفەرەجەی ئەمانکرد (بۆ نموونە بەر لە ناردنی دەقێ بۆ بۆ مۆڵەتپێدان، ئەو دیمەنانەمان دەرئەهێنا، کە ئەترساین زەق بن). سانسۆری بەعس ماندوو نەئەبوو لە تەگەرەدانان لە ڕێماندا، ئێمەیش کۆڵمان نەئەدا. نموونەیێ: ساڵی ١٩٧٨ بە نووسینی شانۆگەریی "نەسرەت دەربارەی شارەکەی ئەدوێ"وە خۆم زۆر ماندوو کرد. چێواریش پلانێکی بەربڵاوی بردنەسەرشانۆی داڕشتبوو. کەچی سانسۆر ڕەفزی کرد. چەند ساڵێ پاشتر، چێوار هەمان شانۆگەریی ناردەوە بۆ مۆڵەتپێدان، بەڵام ناوەکەی گۆڕیبوو بۆ "مرۆڤ و شارەکەی" وەک ئەوەی بابەتێکی تر بێت. بەم گزییە سادەیە توانیبووی کڵاو بکاتە سەری سانسۆر و شانۆگەرییەکە ببرێتە سەر شانۆ.
ساڵی ١٩٧٩ من لە وزەمدا نەما و عێراقم بە یەکجارەکی بەجێ هێشت. ناکۆکیی نێوان ئەندامانی تیپ تیژتر ببووەوە. بەرەیێ بیانووی ئەوە بوو کە بۆ ئەوەی تیپ لە چالاکیدا بەردەوام بێت و مۆڵەتی کارکردنی نەکێشرێتەوە، چاکترە خۆمان لەو بابەتانە بپارێزین، کە ڕژێم دائەچڵەکێنن. بەرەکەی ئەوبەر کە چێوار دەمڕاسیان بوو، ئەوەی ئەهێنایەوە یاد، کە لە ڕۆژگارێکدا کە سەدان هەزار کوردی بێتاوان بە زۆر ڕائەگوێزرێنەوە، دێهاتەکان خاپوور ئەکرێن، دەغڵ و چەمەکان ژەهرڕێژ ئەکرێن، سەرچاوە و کانیاوەکان کوێر ئەکرێنەوە و بە هەزاران کیلۆمەتری چوارگۆشە لە ئینسان بەتاڵ ئەکرێنەوە، عالەمەکە چاوەڕێی ئەوە ناکا بەرهەمێکی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی لەوە بدوێ، کە دیمەنی مانگەشەو دلگیرە، یا ترۆزی بە ترشوخوێی وردەوە بەلەزەتە. پاش نائومێدبوونیان، بوودەڵەکان باروبارخانەیان لێپێچایەوە، بەڵام لە زیانبەخشین نەکەوتن. نموونەیێ: بەر لە ڕاپەڕین کەسێ کرابوو بە ئەمینی گشتیی ڕۆشنبیری، کە کورد بوو، نەک وەک پێشتر عەرەبێکی حەویجەیی.
بێگومان ئەم پیاوە نۆکەری بەعس بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا دانوستاندن لەگەڵیدا مەحاڵ نەبوو. چێوار شانۆگەریی "گوڵعومەر"ی من، کە بەر لە سەفەرکردنم پێم سپاردبوو، نارد بۆ هەولێر بۆ مۆڵەتپێدان و واسیتەیەکیشی دۆزیبووەوە لای جەنابی ئەمینی گشتی قسەیەکی خێر بکا. پاش خوێندنەوەی تێکستەکە، ئەمینی گشتی ڕایگەیاندبوو کە ئەو لە ڕووی مەبدەئییەوە لە دژی بردنەسەرشانۆی شانۆگەرییەکە نییە. بە بیستنی ئەم هەواڵە، کۆنە ئەندامێکی تیپ بە پەلەپڕووزێ لە سلێمانییەوە خۆی گەیاندبووە هەولێر و لە بەردەم زیاد لە شایەتێکدا لە ئەمینی گشتیی گەیاندبوو، کە ئەم شانۆگەرییە لە نووسینی کەسێکە کە هەڵاتووە بۆ دەرەوەی عێراق و نابەجێیە ڕێگای پێبدرێ. ئەمینی گشتیش سڵەمیبووەوە و لە گفتەکەی پێشووی پاشگەز ببووەوە. کورد وتەنی: حەیا قەترەیەکە، کە تکا، تکا! سەرەڕای ماندووبوونی ئەو زاتە، شانۆگەرییەکە هەر برایە سەر شانۆ و بینەران لە هەولێر و لە سلێمانی چەپڵەیان بۆ ماندووبوونی ئەکتەرەکان کوتا، بەڵام بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٩٣، واتا پاش ڕاپەڕین.
دوارۆژی تەممووزی ١٩٧٩ بەرلەوەی بۆ سبەی سلێمانی بە یەکجارەکی بەجێ بێڵم، لەبەر چایخانەکەی مام عەلیدا دوعاخوازیم لە چێوار کرد. ئەوەی هەرگیز ئەقڵم نەیئەبڕی، ئەوە بوو کە ئەو تاوە دواهەمین هەل بێ بۆمان بلوێ باوەش بکەین بە یەکتردا و هەتاهەتایە زەردەخەنەکەی بکرێ بە ژێر خاکەوە. مەرگ لە هەردووکمان بەگوڕتر بوو.
سڵاو لە یادت چێواری هاوڕێم، دڵنیا بە دۆستانی هونەر و کەرامەتی ئینسان لە کوردەواریدا بە شانازییەوە تۆیان بە بیر دێتەوە. تەمەنێکی کورتت بوو، بەڵام تەمەنێ کە پڕ بوو لە بەخشندەیی و خوڵقاندن.

دلاوەر قەرەداغی

# مەرحەباتان لێ بێ گوڵەکان

## بۆ چێوار

به دوامدا مەگەڕێ هاورێم
تا گەڵا بە درەخت و
ترێ بە ڕەز و
منداڵ بە کۆڵان و
کچان بە شەقامەوە بن
من لەوێم
ئێوارانێکی درەنگ

گەر سۆراغت کردم هاوڕێم
لە دوورترین سەوزەڵانیدا نوستووم
لە پاڵ تورەییەکانی (ڤاسیلی) و
لە نێو گلەییە خۆشەکانی خاڵەڤانیا و
تۆزێک لەولا نەوازشە ئارامەکانی
(سۆنیا) وەم
کە هاتیت
تەنها خۆت وەرە هاوڕێم
هەواڵی کەسم بۆ مەهێنە
تەنها هەواڵی گوڵەکەم
نامەی هیچ کەسم بۆ مەخوێنەوە
تەنها نامە شەرمنەکانی گوڵەکەم
هاوڕێم کە هاتیت
پێم مەڵێ
ئەمڕۆ چەند منداڵ مردن و
چەند سوورەچنار ڕەق بوونەوە
پێم مەڵێ
ئەمڕۆ ئاگر لە کوێی تری وڵاتەکەم کەوتەوە و
چەند تانجەرۆ لە تینوواندا خنکان و
عەشق سەری بە چەند (عەولە سیس) هەڵگرت!
من بێزارم هاوڕێم
لە سەری سەعات و
لە سەری مانگان و
لە سەریساڵان
تورەم لە ئیمزای موچەوەرگرتن و
لە دانیشتنی ئیستیعلاماتەکانی سیاسەت

توڕەم لە سەیری
باخچەی بچووک و
عەشقی بچووک و
پیاوی بچووک
بێزارم هاوڕێم
لە شەقامی چۆڵ و
لە شانۆی چۆڵ و
لە شیعری چۆڵ
نیگەرانم لەو زەمەنە بەدەی
کە دوعای ڕەش لە گوڵ و
نوشتەی ڕەش لە پەپوولە کرا
توڕەم لە زەمەنی
نامەی مینڕێژکراو و
پێکەنینی مینڕێژکراو و
ستایشی مینڕێژکراو
بێزارم لە زەمەنێک هاوڕێم
کە شێر زەلیل و باوی ڕێوی بێ *
هاوڕێم کە هاتیت
سەروزیادمە
کۆپلەیەک لە قەسیدەیەکی غەمبار و
تۆزێک لە کوڵی گریانی کاڵزۆ و
جگەرەیەک
سەروزیادمە
چەپکێک لە میهرەبانییەکانی ئەختەر و
قومێک لە قسە خۆشەکانی

داده ڤالا و کاک تۆفیق و ئارام
سەروزیادمە هاوڕێم
چایەکی خەست و
وەنەوشەیەک لە گوڵزاری دڵە گەورەکەی ئازاد!

ئای دالیا گیان
سبەی کە چوویت بۆ مەکتەب
بیرت نەچێ
یەک یەک گوڵەکانی حەوشە بۆنکە
سوبحەینان وەک باوکت
سەری سڵاوت نەویکە و
بە هەزارانی سابونکەران بڵێ:
مەرحەباتان لێ بێ
گلێنەی دیبەکانی بابە
دالیا گیان
ئەوی ساڵێ تۆ منداڵ بوویت
شەوانە بە هەمووماں سیگارێکمان دەپێچایەوە و
تا ڕۆژ دەبۆوە
موتاڵای سەفەرنامەکانی گوڵمان دەکرد
دالیا گیان
تۆ بەحاڵ بیرت دێ
ئەو ئێوارانەی کە (چیخەف) دەهات بۆ ماڵمان و
نیوەشەوانێک باوکت لەگەڵ (تریبیلیۆف)دا
خۆی دەکوشت
ئای دالیا گیان

ئەوی ڕۆژێ

تەنگ نەبوو ئەڵقەی خۆشەویستیی لە پەنجە و

قووڵ بوو

نوستنی ژێر ئاسمانی هاوینان

دەی دالیا گیان

(چا) کە بخەرە سەر ئاگر و

با پێکەوە سەرلەنوێ

بکەوینەوە حونجەکردنی ناوی گوڵەکان

گەر سوبحەینێ لە ڕێی مەکتەب

ئازادی حەمە بچکۆلت بینی
بەئەسپایی بڵێ:
بابە ئێوارە لەوێیە
لای خەمە قژ ماش و برنجییەکانی
گوڵعومەر
گەر هەژاران لە هەواڵیان پرسیم
پێیان بڵێ
تا منداڵ بە کۆڵان و
عەشق لە دڵ و
خەندە بەسەر لێوەوە بێ
لەوێیە
بە ئەسپایی بڵێ:
مەرحەباتان لێ بێ
گوڵەکانی بەریەخەی
عەشقی چێوار!

سلێمانی
مایسی 1996

* دێڕە شیعرێکی سوارەی ئێلخانیزادەی شاعیرە.

# بەردەوان

جەمال غەمبار

چەند سەرنجێکی گوڵنارییە لە نەمردنی هاوڕێم "عوسمان چێوار"

*غەریبیت باش، بەردەوان..!
بەم بەیانییە سادەیە
ئەو بەردانەی بە کۆڵتەوەن
کامیان لە هیی "سیزیف" دەچێ؛
بەردی شۆڕش،
بەردی شانۆ
یان بەردی کورد؟!

بەم بەیانییە سادەیە
لە پەنا ئەو دەریا غەمگینەدا چی دەکەیت،
بە نیازیت خەمێکی وەک خۆت سەرسپی
بۆ کچە گۆشەگیرەکانی کەناری پاییز شەرح بکەیت
یان وەک جاران
چاوەڕێی هاتنەوەی
ئەو قەیاغە مارۆنییانە بکەیت
کە ڕۆژانێ تریفەیان بار کردبوو،
سەوڵیان بە عیشق لێئەدا...
*غەریبیت باش؛ بەردەوان!
ببوورە لە خەوم کردیت
مەگەر تۆ، هەمان قەلەندەرەکەی
جاران نیت
دەتویست لە پەنا سادەییدا
ژوورەکە پڕ کەیت لە دووکەڵی جگەرە و
بۆنی چا...
هەر بە سادەیی، بەختی شیعرت
بۆ پەریزادە بەدبەختەکان،
بۆ سەرابە ماندووەکەی من،
بگریتەوە...
بە سادەیی، ورتەورتێکت دەکرد و دەتوت:
با عاریفانە هەوڵ دەین؛
بیینەوە بە کوڕی ئەو خێڵە قەرەجییانەی
شمشاڵیان دەکردە تیرۆک و
گەڵایان پێ دەشێلا بۆ نان...
ئەو خێڵە قەرەجییانەی

ددانە کلۆرەکانی مانگیان دەکێشا و
ئەستێرەیان لەجێ دەچاند...
*غەریبیت باش؛ بەردەوان!
تۆ ئێمەت فێری ئەوە کرد
وەرزەکانی دڵنەوایی
ببەینەوە بۆ کوختەکانی (گوڵعومەر)،
ئەو کوختانەی لە کەتان چنیبوومان!
فێرت کردین،
ڕێز لە مانگرتنی ئاو بگرین
ئەو کاتەی وشکانی، بەزۆر
فاتوورەی دەعوەتە ساختەکانی
بارانی پێ دەسپێری!
غەریبیت باش،
ئەی موغانی ئەو عومرەی
یەکێ لە بەردەکانی سەرشانت
کە بەردی سەفەر بوو، سەفەر،
بە کۆڵی چ شیعرێکەوە نەدەنووسا...
تازە ڕوخسەتی چیی لە مردن دەخوازیت
کە زیندەگی دوودڵ بێ
لە مانەوە لە نێوان کەلاوەکانی عومرێکی فانی و
گوێنەگرتن لە نائومێدیی
"مەل"ە شەکەتەکەی "چیخۆف"!
غەریبیت باش، بەردەوان!
کە هاتمە لات
باسی مێژووی ئەو دیوارانەت لا کردم
کە لە باخەڵی قوڕدا نووستون و

بڕینی ئەو باخچە نەزۆکانەت نیشان دام
کە بە ناوی گوڵ و نەمامە بێئاگاکانەوە،
سەدان ئاشووب، دژی هەتاو دەگێڕن!
بێهوودە بوو کە هاتمە لات
گۆڕێکی هێمن و لەسەرخۆ نەمابوو
هەندێ ڕاکێشانی تیا قەرزکەم...
سنووقی گومانێک نەمابوو،
سێبەرە هەڵاتووەکانی حەقیقەت و
دۆستایەتیی کوژراوی
نێوان کلیل و دەرگای
خوار و ژووری نیشتمانی تێدا
بشارمەوە!
* غەریبیت باش؛
ببوورە لە خەوم کردیت
ببوورە عەزابە نووستووەکانت
ئەدەمەوە دەست بێداری...
ببوورە تا ئێستا ماوم...
غەریبیت
باش..!

# چێوار
# بۆ شانۆی منداڵ
# سەرەتا و قۆناغە

**دکتۆر فازیل جاف**

دوو ئاماژە بۆ جیهانی چێوار

ژیان و ڕەوتی هونەریی هونەرمەند عوسمان چێوار دەکرێت لە  چەند ڕوویەکەوە باسی لێوە بکرێت:

ئاماژەی یەکەم بەرهەم  و تێکۆشانی چێوارە لە بواری شانۆدا.

لەسەردەمێکی زۆر دژواردا، سەردەمێک کە تێیدا سەخت بوو خۆت ڕووخان و دۆڕان بپارێزێت، سەردەمێک کە

هەموو ئاست و ئاراستەكان دژ بە شانۆكاربوون، چێوار خۆی دروست كرد، خۆی سەلماند.
شانۆ بۆ ئەو تێكۆشان بوو. شانۆ بۆ ئەو پەیام بوو.
لەم دیدگایەوە، دیدگای شانۆ وەک تێكۆشان، ژیانی هونەریی چێوار دەكرێت ببێت بە سەرچاوەی ئیلهام بۆ شانۆكارانی نەوەی ئەمڕۆ.
دەكرێت باس لە چێواری دەرهێنەر، چێواری پەروەدەكار و ڕاهێنەر، ، چێواری وەرگێڕ و دراماتورگ، چێواری ڕابەری شانۆی منداڵ، هەموو ئەمانە بەشێوەی جیاجیا بكرێت.
لە هەموو ئەم بوارانەش گرینگتر چێواری مرۆڤی خاوەن پەیامی مرۆڤانەیە. كە شانۆ بەلایەوە، پەیامێكی سوسیۆلۆژی ڕوون و دیاریكراوی هەبوو، پەیامێكی كۆمەڵایەتی و سیاسی، سەر بە خەڵكی سادە و چینی هەژاران.

ئاماژەی دووەم:
ئاماژەی دووەم لەم كورتە نووسینەدا: ڕۆڵی گرینگی چێوارە لە شانۆی منداڵدا. بە واتەیەكی دیكە: چێواری ڕێبەر و ڕێژیسۆر و ڕاهێنەر و پەروەردەكاربوو لە شانۆی منداڵدا، كە ڕۆڵێكی پێشڕەوە، تاكو ئێستا لێكۆڵینەوەی شیاوی دەربارە نەكراوە.
چێوار لە بزاڤی شانۆی منداڵدا، سەرەتایەكی نۆیی بۆ شانۆی منداڵ لە كوردستاندا تۆمار كرد. سەرەتایەک كە دەكرێت بە سەرەتای مۆركی هونەری لە شانۆی منداڵدا لە قەڵەم بدرێت. واتە شانۆیەک كە هاوكات هونەر و پەروەردەی لە خۆیدا كۆكردبێتەوە.
ڕاستە شانۆی منداڵ لە كوردستان، بە ساڵەهای ساڵا، بەر لە بەرهەمە هونەرییەكانی چێوار مێژوویەكی چەند ساڵەی هەبووە. بەڵام بە بۆچوونی من شانۆی منداڵ لە شێوازی هونەریی و داهێنانی هونەرییدا لە بەرهەمەكانی چێوارەوە و دەستپێدەكات.
ئەوانەی بەرهەمەكانی حەفتاكانی چێواریان بینبێت، شایەتی ئەوە دەدەن كە گیانێكی هونەریی كرد

به بەری شانۆی منداڵدا، بەر لە چێوار شانۆی منداڵ بە گشتی تەنیا ئەرکێکی پەروەردەیی دەبینی، بەڵام لە بەرهەمەکانی چێواردا پەروەردە و هونەر ئاوێتەی یەکدی بوون، بگرە بۆ یەکەم جار هونەر بەسەر پەروەردەدا زاڵ بوو. ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ شانۆ.
شانۆی منداڵ لە شاری سلێمانی حەفتاکاندا ببوو بە مەشخەڵی شانۆی زارۆک نەک تەنیا لە کوردستاندا بگرە مەشخەڵێک بۆ سەرانسەری شانۆی عیراقی. بە تایبەتی کە بەرهەمەکانی چێوار لە فیستیڤاڵە سەرانسەرییەکانی وەزارەتی پەروەردەی عیراق بەشداری دەکرد، چەندین جاریش خەڵاتی باشترین بەرهەمیان پێ دەبەخشرا.
کاری دوو قۆڵی چێواری ریژیسۆر و (سمکۆ ناکام)ی نووسەر و دراماتۆرگ، سەرەتا و پێشەنگی شانۆی هونەریی منداڵن لە کوردستاندا.
هاریکاری و کارکردنی چێوار لەگەڵ ناکامدا نموونەیەکی سەرکەوتووی هاریکاریی پتەوی ریژیسۆر و نووسەری شانۆییە.
نموونەی کاری دوو قۆڵی دەرهێنەر و نووسەر لە مێژووی شانۆدا زۆرن، چیخۆڤ وستانیسلاڤسکی/ مییرهولد و مایکۆڤسکی دوو نموونەی گەورەن.
لە کوردستاندا نموونەی لەم جۆرە گەلێک دەگمەنە.

زۆر ڕۆیی نییە گەر بڵێم: کاری چێوار/ ناکام و دەرئەنجامە سەرکەوتنەکانی هانی سمکۆ ناکامی نووسەری دا کە لە چەند ساڵێکدا، یەک لە دوای یەک، چەندین بەرهەمی سەرکەوتوو پێشکێش بە شانۆ بکات. پاش لێکترازانی چێوار و سمکۆ. خامۆشییەک شانۆی منداڵانی داگرت.
ئەگەر لێم بپرسن: چ تایبەتمەندییەک وای لە نمایشەکانی چێوار دەکرد، کە مۆرکێکی هونەریی راستەقینەیان هەبێت؟ بێ سێ و دوو دەڵێم: دروست بەکارهێنانی موزیک.
چێوار نەک تەنیا زیرەکانە و لە نزیکەوە مامەڵەی لەگەڵ نووسەر و دراماتورگ دەکرد، ئەو بەهەمان شێوەی شان بەشانی مامۆستایانی موزیک وەکو مامۆستا دلێر ئیبراهم و مامۆستا سەلاح رەئووف و مامۆستا عوسمان رەئووف دەکرد.

کێ بێت " گۆرگی بێشەو هەردی" لە بیر چووبێت؟ من بۆ خۆم تاکو ئێستا بە زمانی کوردی لە چوارچێوەی شانۆی منداڵدا لەم بەرهەمە جوانترم نەدیووە.
کاتێک کە "گەلاوێژ و گۆرگ" م لە شاری سوێد بۆ شانۆ دەرهێنا، نایشارمەوە کە " گورگی بێشەو هەردی" ی چێوار وەکو هونەر و دارشتەی دراماتورگیی دەقەکەی سمکۆ ناکام سەرچاوەی ئیلهامم بوون، هەرچەندم دەکرد نەمدەتوانی لە ژێر کاریگەری نمایشەکەی چێوار دەربچم.
ئەی " بەیتی رێزان کێ" کە خۆی لە خۆیدا شاکارێکی بێ ئەندازە جوانی شانۆی منداڵان بوو؟ جگە لە تێکستەکەی، موزیک و گورانییەکانی و لایەنی ریتمیک" ئیقاع"ی نمایشەکە لە بیر وئەندێشە نەک هەر منداڵان بگرە گەورەکانیش جێگیربووبوون.
تێکست و موزیک و پەیامی ڕوون سەرچاوەی هێزی نمایش بوون لە شانۆی منداڵی چێواردا.

لەم دیگایەوە: چێوار بۆ شانۆی منداڵ سەرەتا و قۆناغە.

# لە زاری هاوسەرەکەی چێوارەوە

## ئەختەر محەمەد جەلال، هاوسەری مامۆستا (عوسمان چێوار) به سادەیی و وەکو خۆی باس لە ژیانی مامۆستا عوسمان چێوار دەکات:

مامۆستا چێوار لە ساڵی ١٩٤٦ لە سلێمانی لە گەڕەکی دەرگەزێن لەدایک بووە، باوکی شێخ محەمەد شێخ ئەحمەدی زێوەمەری سەر بە ناحیەی قەرەداغ، دایکی سەفسە خانی کچی شێخ مستەفای شێخ عارفی بەرزنجییە، مامۆستا ئیبراهیم چێواری برای و سەعدیە خانی خوشکی لە ماڵێکی گڵی سادە بەرامبەر ئامادەیی سلێمانی کچان دەژیان، ئێستاش هەر لەو ماڵەداین... خۆم و منداڵەکانم.
من ١٩٧٢/٩/١١ هاوسەرگیریم لەگەڵ مامۆستا چێوار کرد، بۆ زانینی بەڕێزتان من و مامۆستا چێوار پورزاین.

پێنج منداڵمان هەیە (کاڵزۆ، کاروان، دالیا، ڕەنج، کۆسار) کاڵزۆ دەرچووی کۆلێژی پەروەردەیە لە زانکۆی سەلاحەدین بەشی ماتماتیک. کاروان و دالیا دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانن بەشی شانۆ، ڕەنج دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانە بەشی پەیکەرسازی، کۆسار دەرچووی زانکۆی ئەمریکییە بەشی ئایتی.

کە هاوسەرگیریم کرد مامۆستا چێوار، مامۆستا بوو لە هەڵەبجەی شەهید، لە ساڵی ١٩٧٠ پەیمانگای مامۆستایانی لە سلێمانی تەواوکردبوو، ساڵی ١٩٧٤ کە هەڵبجە بۆردوومان کرا ماڵمان لە هەڵەبجە بوو نەمانتوانی و ڕیگەمان لێگیرا، ڕوومان لە ئێران کرد بۆ ماوەی یەک ساڵ، دواتر گەڕاینەوە بۆ سلێمانی هەر لەو ساڵەدا لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی هاوڕێی (تیپی شانۆی پێشڕەو) یان دامەزراند، دەستیان کرد بە کاری هونەریی، چەند ئیشێکی ناوازەیان پێشکەش کرد وەک (لانەوازان، پاڵتۆ، گوڵەمێخەک) و چەند ئیشێکی تر. دواتر مامۆستا چێوار وەک دەرهێنەرێک لە (تیپی پێشڕەو) کاری کرد.

شانۆی (ئەحەی کرنو، گوڵعومەر، درندەی تۆرۆس، ژیانی ڕۆژانە، مرۆڤ و شارەکەی و مێووژی بەرخۆر و چەندینی تر).

مامۆستا چێوار وەک ئەکتەرێکی سەرکەوتوو ڕۆڵی لە چەندین کاری شانۆییدا بینیوە وەک (ڕەجەب و پیاوخۆران، ئابلۆقە، خەج و سیامەند).

لە بیرم نەچێ لە ماوەی دوو ساڵی مامۆستایی لە هەڵەبجە، کاری شانۆیی دەکرد وەک بۆیاخچی و داسەکەی شاسوار، ئەگەر پێویستی کرد هەموو کارەکانی بە ڕیزبەندی دەنووسین چونکە لە ئێستادا زۆریانم بیرنایەت ببوورن لەپاڵ ئەمانەشدا کاری بۆ منداڵان دەکرد وەک (بەیتی ڕێزانکێ، داپیرەی دانا، گورگی بێشە و هەرد، گوڵە پەلکەزێڕینە). سێ ساڵ لەسەر یەک لەسەر ئاستی عێراق پلەی یەکەمی بەدەست هێنا، خەڵاتی زێڕینی بۆ دەرچوو، بەڵام بە سەربەرزییەوە ڕەتی ئەکردەوە و ڕازی نەدەبوو بە وەرگرتنی خەڵات لەلایەن حکومەتی بەعسەوە، بۆیە هەر لەو ڕۆژانەدا کە خەڵات وەردەگیرا هەر بەیانی زوو لەگەڵ (سمکۆ ناکام)ی هاوڕییدا دەچوون بۆ تێرمیناڵی بەغداد بۆ ئەوەی زوو بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، بۆ زانیاری بەڕێزتان لەوکاتەدا زۆر لە قەڵەم فرۆشان و هونەرمەندانی شارەکە خەڵاتیان وەردەگرت، وەک سەیارە و ئاڵتوون و ئەرزە و خانوو.

مامۆستا چێوار لەبەرئەوەی کە نەگیرێ و بەر سین و جیم نەکەوێ، خۆی نەقلی گوندی (باڵخ) کرد.

هەر لەو ماوەیەدا لەبیرم بێ شانۆیی (گوڵەمێخەک) یان پێشکەش کرد، پێی وتم ئەمڕۆ (جەماعەتی ئەمن) دێن بۆ بینینی شانۆگەرییەکە، ئەگەر گیرام سەر بە کۆشی کەسدا نەکەیت من خۆم ئەو ڕێگەیەم هەڵبژاردووە تۆ دانیشە منداڵەکان بەخێوبکە و ئاگات لێیان بێت.

ئەوەبوو چووبوون بۆ بەیانی مامۆستا چێواریان بانگ کردبوو بۆ ئەمن، پێیان وتبوو تۆ هونەرمەندێکی هەموو کارەکانت دژ بە ڕژێمی ئێمەیە و چاوەڕێ ئەکەین هەر تەقریرێک بێت بۆمان زمانت لە گوێچکەوە دەردەهێنین، دواتر پێی دەڵێین برۆ.

هەرچۆنێک بێت خێزانێکی کامەران بووین، چونکە خێزانەکەمان وەکو من و مامۆستا چێوار و منداڵەکان و مامۆستا ئیبراهیم و پورم و مامە شێخ زۆرمان یەکتر خۆشدەویست، ژیانێکی سادە و فەقیرانەمان هەبوو پێی ڕازی بووین، کەڵ ئەژیاین سەرمان بەرزبوو.

لەدوای لەسێدارەدانی براکەم ساڵی ١٩٨٧ ژیانمان ناخۆش بوو، مامۆستا چێوار تا دەهات بێزار ئەبوو، تا ڕۆژێک ڕێکەوتی ١٩٨٨/٨/٥ وتی ئەڕۆمە دەرەوە ئاگات لە خۆت و منداڵەکان بێت، وتم چیت بەدەستەوەیە بیکەیت، وتی هیچ قابیلە چیم پێدەکرێ دژی ئەمانە هەمووی دوو کاتژمێری پێنەچوو مامۆستا چێواریان

چێوار

هێنایەوە بە خەڵتانی خوێنەوە، لە بەردەرکی سەرا هەمیشە قوات و ئەمنی لێبوو، مامۆستا چێوار بە عەرەبی جنێو و هێرشی کردبووە سەر سەدام و ڕژێمەکەی.. زۆریان لێدابوو، وستبوویان بیکوژن خەڵکی سلێمانی شاهیدی ئەو ڕۆژەن، لەوکاتەدا کوڕێک کە ناوی شاهۆی بەلەدیە بوو خەڵکی سلێمانی بوو دیاربوو لە دوورەوە مامۆستا چێواری خۆشویستوە پێیان دەڵێت مەیکوژن ئەمە هونەرمەندێکی ناسراوی شارەکەیە ئەگەر بیکوژن شارەکە ئەشلەژێت. مامۆستا چێواریش پێیان دەڵێت (بمکوژن، بمسوتێنن بەڵام گەلەکەم مەکوژن، دەتوانن بمسوتێنن، بەڵام ناتوانن بە جەستەی گڕگرتووم قۆریەک چای پێ گەرم بکەنەوە).

ئەوەندەم نەزانی بە سەیارەیەک مامۆستا چێواریان هێنایەوە هەر هوتافی دەکێشا و... بمبوورن گریانم دێت بۆ ئەو ڕۆژگارانەی مامۆستا چێوار، من بە فەخرەوە باسی دەکەم بەڵام زۆر لەسەر تەندروستیم دەکەوێ... مامۆستا چێوار کەسێکی بلیمەت و خۆشەویست و سادەی شارەکە بوو، هەموو خۆشیان دەویست.

لەبیرم نەچێت لە ساڵی (١٩٨٣) مامۆستا چێوار لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی هونەرمەندی وەک (کامل ئەحمەد و جیهاد دڵپاک و عومەر سەرکار و کەمال سابیر و فەرەیدون دارتاش) یەکێتی هونەرمەندانیان دامەزراند، لەناو

شاردا زۆرجار کۆبوونەوەیان لە ماڵی خۆمان دەکرد بە نهێنی.
لە ساڵی (١٩٩١) لەدوای ڕاپەڕینی گەلی کورد دژ بە ڕژێمی بەعس وەرچەرخانێک بوو بۆ مامۆستا چێوار، چونکە ئاواتی چەند ساڵەی بوو، ١٦/٤ی هەمان ساڵ کۆڕەوە مەزنەکە بوو، ئێمەش ملی ڕێگەمان گرت و ڕۆشتین بە پێ بەرەو پێنجوێن، شەش شەو و شەش ڕۆژ بە ڕێگاوە بووین تا گەیشتینە ئەوێ نزیکەی (٧) مانگ ماینەوە لەوی مامۆستا (کامل ئەحمەد) هونەرمەندی شێوەکار بە کامێرایەکی فۆتۆی خۆی وێنەی ناو پێنجوێنی دەگرت کە ڕووخابوو وردەکاری زۆر جوانی لەناو فۆتۆکاندا کردبوو، دوای تەواوبوونی وێنەکانی زانیبووی کە وێنەکان پێویستیان بەوە هەیە کە بدوێن لەسەر خۆیان، بۆیە بیری لەوە کردەوە کۆپلە شیعریان بۆ دابنێت، مامۆستا کامل بە چێواری وت کە دەبێت ئەم پرۆژەیە بەیەکەوە بکەن، مامۆستا چێواریش دەستی کرد بە نووسینی کۆپلە شیعر بۆ پۆستەرە وێنەکان، ماوەی سێ مانگ سەرقاڵی ئەوەبوو تا دواتر (پێنجوێنی گوڵەزەرد)یان لێ دروست کرد و لە وڵاتی سوید چاپکرا تا ئێستایش ئەو پرۆژەیە لە کوردستاندا نەبینراوە.
پاش ئەوە چێوار سەرقاڵی دەرهێنانی (گوڵەمێخەک) بوو، وەک درامایەکی تەلەفزیۆنی، لەوکاتەدا (عەباس عەبدولڕەزاق) پەیوەندی پێوەدەکات بۆ دامەزراندنی تەلەفزیۆنێکی کوردی.
ئەوەش ئاواتی چێوار بوو، چونکە هەر لە ساڵی (١٩٨٣)دا مامۆستا چێوار و چەند هونەرمەندێکی تر (ئیعتیسامیان) گرت لەناو حەوشەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی، یاداشتێکیان نووسی بۆ بەرپرسانی ئەو کاتە، یەکێک لە بڕگەکانی ئەو یاداشتە دامەزراندنی تەلەفزیۆنێکی کوردیی بوو کە منداڵان تیایدا بە کوردی سەیری فیلم کارتۆنی کوردی بکەن.
ئەوەبوو گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و یەکەم ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی کوردی لە ماڵی خۆمان دروست کرا کە لەناو خۆشیاندا ناویان لێنا (ستۆدیۆی دۆشەکەڵە) دواتر گواسترایەوە بۆ قەڵاچوالان و دواتر بۆ بینایی زانکۆی سلێمانی.
مامۆستا چێوار شانبەشانی کارەکانی لە تەلەفزیۆن، بەردەوامیش هەر خەریکی کارە هونەرییەکانی بوو، هەر لە وەرگێڕان و کارە هونەرییەکانی تری وەک نووسین و سیناریۆی (بەهەشتێکی سوتاو) کە فیلمێکی سینەمایی بوو پاشان ئامادەکردن و دەرهێنانی (مرۆڤ و شارەکەی) وەک درامایەکی تەلەفزیۆنی و ئامادەکردن و دەرهێنانی شانۆگەری (ئەحەی کرنوو) و پاشان سیناریۆی تەواونەکراوی (خولەپیزە) و زۆر پرۆژەی دیکەش کە بەداخەوە مەرگ نەیهێشت.
ڕێکەوتی ١٩٩٦/٥/٢١ چێوار دڵە مەزنەکەی لە لێدان کەوت لە تەمەنی (٥٠) ساڵیدا کە پێنج دیناری قەرز لە گیرفانیدا بوو. بەڵێ کەسێکی ماندووی خێر لە خۆ نەدیوی خۆبەخش بۆ هونەر و گەل و نیشتمانەکەی ئاوا بەجێی هێشتن.